بسم الله الرحمن الرحيم

﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا لُقْمَـٰنَ ٱلْحِكْمَةَ أَنِ ٱشْكُرْ لِلَّهِ ۚ
وَمَن يَشْكُرْ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن كَفَرَ
فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ حَمِيدٌ﴾

**لقمان: ١٢**

- ناوی کتێب : وتەو پەندەکانی لوقمانی حەکیم
- کۆکردنەوەی: جەزا بارامی
- تایپ: ڕەوا جەمیل – یعقوب أحمد
- دیزایین: سەنتەری یاد
- بەرگ: ڕەوا جەمیل
- نۆبەی چاپ: چاپی سێیەم
- ساڵی چاپ: ٢٠١٠
- تیراژ: ( ٣٠٠٠ ) دانە

## پێشەکی

### بەناوی خوای گەورەو میهرەبان

بەڕێزان : راجیایی هەیە لەنیوان زانایاندا کە ئایا لوقمانی حەکیم پێغەمبەر بووە یان نا بەلام بۆچوونی بەهێز تر ئەوەیە کەپێغەمبەر نەبووە لوقمانی حەکیم لە سەردەمی پێغەمبەر داود دا ژیاوە پیاوێکی رەش پێستی حەبەشی کۆیلەو دارتاش بووە خوای گەورەش سورەتێکی بەناوی ئەوەوە ناوناوە و هەندێك لە ئامۆژگاریەکانیشی لەو سورەتەدا هاتووە ئەم کتێبەی بەردەستیشتان وتەکانی ئەو پیاوەیە کەبە راستی پەندەکانی چونکە گشتگیرن بۆ هەموانە لە پێش هەموانیشدا دەبێت دایکان و باوکان سود لەم ووتانە وەربگرن لەپەروەدەکردن و پیگەیاندنی رۆڵەکانیاندا

حوزەیرانی ٢٠٠٩

# وته و پەندەکانی لوقمانی حەکیم

١- کوڕە شیرینەکەم: نەکەی کەسێك یان شتێك بکەی بەهاوبەش و هاوتای خوا، چونکە بەڕاستی هاوتاو هاوبەش پەیداکردن بۆخوا ستەمێکی گەورەیە کە مرۆڤ لەخۆی دەکات.

٢-ئەی کوڕی ئازیزم: بەڕاستی ئەگەر گوناهێك بەئەندازەی تۆوی خەردەلەیەك هەبێت و لەناو بەردێکدا لەناو ئاسمانەکان یان لەزەویدا حەشار درابێت خوا دەیهێنێتەوە ڕێت، بەڕاستی خوا هیچ شتێکی لاشاراوە نییەو زۆریش ئاگادارە.

٣- کوڕی شیرینم: نوێژەکانت بە چاکی ئەنجام بدە، فەرمان بکە بەچاکەو ڕێگری بکە لەخراپەو ئارام بگرە لەبەرامبەر ئەو ناخۆشیانەی توشت دەبن، بەڕاستی ئەوانەی کە باسکران شتانێکن کە دەبێت هەر ئەنجام بدرێن.

٤- کوڕی شیرینم: ڕووت وەرمەگێڕە لەخەڵك و بەنازو فیزەوە مەڕۆ بەسەر زەویدا، بەڕاستی خوا ئەوکەسانەی خۆشناوێت کەبە نازو فیزەوە بەسەر زەویدا دەڕۆن.

٥- کوڕی شیرینم: لەکاتی ڕۆشتندا مامناوەندی بڕۆو بەدەنگی نزم قسە بکە، چونکە بەڕاستی ناخۆشترین دەنگ و بێزارترین دەنگ دەنگی گوێدرێژە.

٦- کوڕی خۆم: ئامۆژگاریت دەکەم بەدوو شت کە دەستیان پێوە بگریت سەلامەت دەبیت ١(پارە تا پێی بژیت) ٢(ئایین بۆ سەرفرازی ڕۆژی دوایت).

٧- ئەی کوڕی شیرینم: بەهۆی کەسابەتی حەڵاڵەوە خۆت لە هەژاری بپارێزە چونکە هەرکەسێك هەژار بوبێت سێ شتی تووش بووە ١(کورتی لە ئاینەکەیدا)٢(لاوازی لە عەقڵیدا)٣(نەمانی پیاوەتی) لەو سیانەش گەورەتر خەڵك بەسووك تەماشای دەکەن.

٨- کوڕی خۆم: دانایی و حیکمەت هەژار دەکات بەپاشا، نەکەی قیناع بپۆشی بەشەو ترسناکەو بەڕۆژ بێزراوە.

٩- ئەی کوڕی شیرینم: لە کارەکانتدا ڕاوێژ بەخاوەن ئەزموونو دنیا دیدەکان بکە تا بیروبۆچوونی خۆیانت بەخۆڕایی بدەنێ کە خۆیان بەهەوڵ و ماندووبوون دەستیان کەوتووە.

١٠- ئەی کوڕی خۆم: ئەگەر گەدەت پڕ کرد بیرکردنەوەت نامێنێتو دانایت کەڕدەبێتو ئەندامانی لاشەت هەمووی لە کاردەکەون .

١١- ئەی کوڕی شیرینم: زۆر یادی خوا بکە، چونکە کەسێك یادی خوا بکات خوای گەورەش یادی ئەو کەسە دەکات.

١٢- ئەی کوڕی خۆم: باگوناهەکانت هەمیشە لەبەرچاوت بن، چاکەکانیشت پشت گوێ بخە، لە گوناهەکانت پەشیمان بەو چاکەکانت بەزۆر مەزانە.

١٣- ئەی کوڕی شیرینم: هەرکاتێ گوناهبارێکت بینی قسەی پێ مەڵێ، لەو کاتەدا گوناهەکانی خۆت بێنەوە یاد چونکە تۆ تەنها پرسیاری کردەوەکانی خۆت لێ دەکرێت.

١٤- ئەی کوڕی خۆم: گوێڕایەڵی خوابکە، چونکە هەر کەسێك گوێڕایەڵی خوا بکات هەرچی ئاوات و مەبەستی هەیە بۆی جێ بەجێ دەکاتو لە خراپەی خەڵکیش دەپارێزێت.

١٥- ئەی کوڕی خۆم: گوێ بەدنیا مەدەو دڵت پێی خۆش نەبێت چونکە تۆ بۆئەوە دروست نەکراویت، خوای گەورە هەر شتێکی لەدنیادا دروستکردبێت زۆر ئاسانتر بووە لەلای لە دروستکردنی خودی دنیا، لەبەرئەوەی هیچ خۆشیەکی نەکردووە بەپاداشت بۆ چاکەکارانوهیچ ناخۆشییەکیشی نەکردووە **بەسزا**بۆ خراپەکاران.

١٦- ئەی کوڕی خۆم: ئارام بگرەو خاوەن باوەڕ بەو جیهادی نەفست بکە، بزانە کە ئارامگرتن بلندیو گەورەییو بەزەییو دنیا نەویستیو هەستکردن بەچاودێری خوای تیایە، هەرکاتێ لەبەرامبەر حەرامدا ئارامگر بوویتو دنیات بەکەم گرتو

نارِه‌حه‌تییه‌كانیت له‌لا هیچ نه‌بوو ئه‌وكاته هیچ شتێك له‌مردن به‌لاته‌وه خۆشتر نابێت‌و چاوه‌ڕێی مردن ده‌كه‌یت.

١٧- كوڕی خۆم: له‌یادی خوا بێ ئاگا مه‌به‌و له خوابترسه‌و باكه‌سیش پێت نه‌زانێت خه‌ڵكی له‌خۆت بایت نه‌كه‌ن، به‌قسه‌ی نه‌زان نه‌خه‌ڵه‌تێی، چونكه به‌ڕاستی تۆ مرواری له‌ده‌ستایه‌و واده‌زانی پشقله.

١٨- كوڕی شیرینم: نه‌رم‌و نیان به‌، هه‌میشه هاوڕێی چاك به‌، زۆر بیربكه‌ره‌وه‌و كه‌م قسه بكه مه‌گه‌ر له وتنی ڕاستیدا زۆر بگری‌و كه‌م پێبكه‌نه‌، گاڵته‌و سوعبه‌ت زۆر مه‌كه‌و قیژه قیژ مه‌كه‌و ده‌مه‌قاڵێ زۆر مه‌كه‌، هه‌ر كاتێك بێده‌نگ بوویت با بێده‌نگییه‌كه‌ت بیركردنه‌وه بێت هه‌ر كاتێكیش قسه‌تكرد به‌دانایی قسه بكه.

١٩- كوڕی شیرینم: ماڵه‌كه‌ت به‌فیڕۆ مه‌ده ماڵی خه‌ڵكیش به‌چاك مه‌زانه‌، ماڵی خۆت ئه‌و ماڵه‌یه كه‌له‌پێش خۆتدا به‌ڕێی ده‌كه‌یت‌و ماڵی خه‌ڵكیش ئه‌و ماڵه‌یه كه‌له دوای مردن به‌جێی ده‌هێڵیت.

٢٠- ئه‌ی كوڕی شیرینم: هه‌موو هه‌وڵێكت له چاكه‌دا بابه‌زۆر له‌خۆكردن بێت‌و هه‌رگیز نه‌ڵێی به‌سه‌، ئه‌وه‌نده‌ش گرنگی به‌دنیا مه‌ده كه ئاگات له‌خۆ ئاماده‌كردن بۆ ڕۆژی دوایی نه‌مێنێت.

٢١- ئه‌ی كوڕی خۆم: هه‌ركاتێك خوای گه‌وره نیعمه‌تێكی پێ به‌خشیت با شوێنه‌واری نیعمه‌ته‌كه‌ی به‌سوپاس گوزاریت بۆی‌وخۆبه‌كه‌م زانینت به‌رامبه‌ری‌و چاكه‌كردن له‌گه‌ڵ خه‌ڵكیدا ببینێت به‌سه‌رته‌وه هه‌موو شتێك به‌ڵای خۆی هه‌یه‌، به‌ڵای كرده‌وه‌ی چاكه‌ش له خۆڕازی بوونه.

٢٢- ئه‌ی كوڕی خۆم: ئه‌نجامدانی نوێژه فه‌رزه‌كان له هه‌موو كارێك چاكتره.

٢٣- ئه‌ی كوڕی خۆم: له‌گه‌ڵ كۆمه‌ڵێكدا دابنیشه كه یادی خوابكه‌ن، چونكه ئه‌گه‌ر زانابیت ئه‌وا زانسته‌كه‌ت سوودت پێ ده‌گه‌یه‌نێ، خۆ ئه‌گه‌ر نه‌زانیش بیت فێری شتت

دەکەن، ئەگەر بەزەیی خوا یان ڕۆزی خوا دابارێ بەسەریاندا ئەوا تۆش بەشدار دەبیت تیایدا.

٢٤- ئەی کوڕی شیرینم: لەگەڵ کۆمەڵێکدا دامەنیشە کە یادی خوا ناکەن، چونکە ئەگەر نەزان بیت ئەوا زیاتر نەزانت دەکەن، خۆ ئەگەر زاناش بیت ئەوا زانستەکەت سوودت پێ ناگەیەنێ، ئەگەر نەفرەتی خوا یان توڕەیی خوا دابارێ بەسەریاندا ئەوا تۆش بەشدار دەبیت تیایدا.

٢٥- کوڕی خۆم: سوپاسی کەسێك بکە کە چاکەت لەگەڵدا دەکات و چاکەش لەگەڵ کەسێك بکە کە چاکەت لەگەڵ دەکات، چونکە نیعمەت بەهۆی سپڵەییەوە لەناودەچێت و بەهۆی سوپاسکردنیشەوە دەمێنێتەوە.

٢٦- ئەی کوڕی شیرینم: بەڕاستی دنیا دەریایەکی قوڵەو خەڵکانێکی زۆر تیایدا خنکان، با کەشتیەکەشت تیایدا تەقوای خواو کردەوەی چاکەو ئەو توێشووەت بێت کە هەڵی دەگریت، هەوڵبدە باتیایدا قازانج بکەیت، ڕۆژەکانی شەپۆلی دەریاکەن و کتێبەکەی خواش ڕێنیشاندەرەو گێڕانەوەی نەفس لە ئارەزوو حەبلەکانێ و مردنیش کەنارەکەیەتی و قیامەتیش سەختەو تۆ دەچیت بۆ ئەوێ و فەرمانڕەواش لەوێ هەر خوایە.

٢٧- ئەی کوڕی شیرینم: تەوبەکردن دوامەخە چونکە لەپڕ مردن یەخەت پێ دەگرێت.

٢٨-ئەی کوڕی شیرینم:ئەگەر ویستت هاوڕێیەتی کەسێك بکەیت سەرەتا توڕەی بکە ئەگەر لەکاتی توڕەییەکەیدا ئارامی گرت ئەوا باشە ئەگەر نا ئەوا هاوڕێیەتی مەکە.

٢٩- ئەی کوڕی خۆم: لەو ڕۆژەوە کە تۆ هاتویتە دنیاوە تۆ پشتی تێ دەکەیت و لەقیامەت نزیك دەبیتەوەو بەرەو لای دەڕۆیت.

٣٠- ئەی کوڕی خۆم: خۆت لەقەرزکردن بپارێزە چونکە دەبێتە هۆی زەلیلی ڕۆژو خەفەتی شەو.

٣١- ئەی کوڕی خۆم: هەمیشە بڵێ خوایە لێم خۆشبە چونکە هەندێ کات هەیە پارانەوە تیایدا گیرادەبێت.

٣٢-ئەی کوڕی شیرینم: لەوکەڵەشێرە زیرەکتربە لە کاتێکدا ئەو لەگەڵ بەرەبەیاندا دەخوێنێ و تۆش لە ناو جێگەکەتدا خەوتویت.

٣٣ -ئەی کوری شیرینم: هەرکەسێك لەتوانای خۆی زیاتر هەڵبگرێت پەکی دەکەوێت، هەر کەسێك بەخۆی بنازێت تیا دەچێت، هەرکەسێك فیز بەسەر خەڵکیدا لێ بدات خوا زەلیلی دەکات، هەر کەسێك بۆ کارەکانی ڕاوێژ نەکات پەشیمان دەبێتەوە، هەر کەسێك هاوەڵێتی زانایان بکات زانیاری فێر دەبێت هەر کەسێك کەم قسە بکات بێوەی دەبێت.

٣٤-کوڕی خۆم:لەناو نوێژدا، ئاگات لە دڵت بێ لەناو خەڵکیدا ئاگات لە زمانت بێ لەکاتی نانخواردندا ئاگات لەسکت بێ لەکاتی میوانیدا ئاگات لەچاوت بێ، دوو شتت هەمیشە لەیاد بێت خوای گەورەو مردن دوو شتیش هەمیشە لەیادبکە چاکەی خۆت بەرامبەر خەڵکیو خراپەی خەڵکی بەرامبەر خۆت.

٣٥- کوڕی خۆم: بەبێ هۆ قسە مەکە بەئەدەبەوە بەڕێدا بڕۆ، پرسیار لەشتێك مەکە کە پەیوەندی بەتۆوە نەبێت ماڵو سامانت بەفیڕۆ نەدەیتو ماڵی خەڵکی پێ چاك بکەیت، ماڵو سامانی ڕاستەقینە ئەوەیە کە پێشی خۆتی بدەیت بۆ قیامەت.

٣٦- ئەی کوڕی خۆم: لەسەر ئەژنۆ بچۆ بۆلای زانایانو بەدڵ گوێیان لێبگرە بەڕاستی دڵ بەزانست ئەبوژێتەوە هەروەك چۆن زەوی وشك بەبارانی پەڵە زیندوو ئەبێتەوە.

٣٧- ئەی کوڕی خۆم: کاتێ لەش ساغ بوویت دڵخۆش مەبەو ناخۆشیو دڵتەنگی خۆت بشارەوە ئەمە ئەوپەڕی خەسڵەو چاکەیە، ئارامگربە لەسەریان بۆت دەبێت بەتیشوو لە دوارۆژدا.

٣٨- کوڕەکەم: بەکەم ڕازی بە، بەبەشی خۆت دڵگران مەبەو چاوت لەدەستی خەڵکی نەبێت، چونکە ئازارت دەداتو هیچیت دەست ناکەوێت، با گوناهەکانت لەبەرچاوبن تا مردن،بەڵام باچاکەکانت لەبەر چاو نەبێت چونکە کەسێك لای خۆی تۆماری کردووە کەهەرگیز لەیادی ناچێت.

٣٩- کوڕی شیرینم: ئەگەر ئارەزوو زاڵ بوو بەسەر هەرکەسێکدا ئەوا دڵی تاریك دەکات، ئەگەر دڵی تاریك بوو ئەوا سنگو دەروونی گرژ دەبێت.

٤٠- کوڕی خۆم: هەرکەس کەم قسەبکات بێوەی دەبێت، هەرکەس وتەی چاك بێت بێوەی دەبێت، هەرکەس قسەی پڕوپووچ بکات تاوانبار دەبێت، هەرکەس خاوەنی زمانی خۆی نەبێت پەشیمان دەبێت.

٤١- ئەی کوڕی خۆم: فەرمان مەکە بەچاکەو خۆت لەیاد بکەی، ئەگەر وا بکەیت تۆ وەك ئەو کەسە وایت کە چرایەکی پێبێت ڕوناکی بۆ خەڵك بێنێتو خۆی بسوتێنێت.

٤٣- کوڕی خۆم: من ئاسنو پۆڵام زۆر هەڵگرتووە بەلامەوە زۆر قورس بووە، بەڵام هیچی بەلامەوە لەهاوسێی خراپ قورستر نەبووە، ناخۆشی زۆریشم بینیوە بەڵام هیچی لەهەژاری ناخۆشتر نەبووە.

٤٤- کوڕەکەم، بینایی چاوم: نەکەی درۆبکەی زمانت لە درۆکردن بپارێزە، چونکە ئەوەی درۆبکات شەرمو ئابڕوی ئەتەکێتو سەنگی نامێنێتو لای خەڵکی متمانە لەدەست ئەدات.

٤٥- ڕۆڵەکەم: ئەوەی بەدڕەوشت و خراپەکار بێت تەنگ و چەڵەمەو خەفەتی زۆر دەبێت و هەمیشە دڵی غەمبار دەبێت.

٤٦- ڕۆڵە گیان: هەڵگرتنی بەرد ئاسانترە لە تێگەیاندنی پیاوی نەفام و تێنەگەیشتوو.

٤٧- ڕۆڵەکەم، جگەر گۆشەکەم: ئەوەندە لەخوا بترسە کەلەبەزەیی خۆی نائومێدو بێ نیازت نەکات، ئەوەندەش لەخوای گەورە دڵنیابە کە جورئەتی گوناهکردنت پێ نەدات.

٤٨- کوڕی خۆم: سێ کەس هەن لە سێ بواردا نەبێ تاقی ناکرێنەوە، پیاوی ئارامگر لەکاتی توڕەیدا دەردەکەوێ، پیاوی ئازا لەکاتی شەڕدا دەردەکەوێ، هاوڕێ لەکاتی پێویستی و تەنگانەدا دەردەکەوێ.

٤٩- ڕۆڵە، ڕۆشنایی دیدەکانم، هێزی ئەژنۆو بڕبڕەی پشتەکەم: تاڵی و سوێری زۆرم چەشتووە، بەڵام بەخوا لەهەژاری تاڵترم نەچەشتووە، کۆڵی ئاسن و قوڕقوشم زۆر کێشاوەو بارکردووە بەڵام لەقەرزاری قورسترم نەبینیوە.

٥٠- ئەی کوڕی خۆم: ئامادەی مردوو ناشتن بە بەڵام ئامادەی شایی و ئاهەنگ مەبە چونکە مردوو قیامەتت بیردەخاتەوە بەڵام شایی خۆشی دنیات ئەخاتە دڵ.

٥١- کوڕی خۆم: نان مەخۆ بەسەر تێریدا ئەگەر ئەو نانە بدەی بەسەگ باشترە لەوەی کەخۆت بیخۆیت و برسیت نەبێت.

٥٢- ئەی کوڕی خۆم: مەبە بەشیرینیەك کە خێرا قوت بدرێت و مەبە بەتاڵییەك کە تف بکرێتەوە.

٥٣- کوڕی خۆم: هێندە دڵ بەدنیا مەدە بەجۆرێك قیامەتت بدۆڕێنی و شەرمەزاری لای خوا بیت، ئەوەندەش دەست لەدنیا بەرمەدە کە ببیتە مشەخۆر بەسەر خەڵکییەوە.

٥٤- کوڕی خۆم: ئەوەی سەرزەنشتی خۆی بکات براوەیە، ئەوەی سەرنجی ئەنجامی کارەکانی بدات سەرکەوتووە، ئەوەی شوێنکەوتەی ئارەزووەکانی بێت گومڕایە،

ئەوەی ئارامبگرێت سەربەرزە، ئەوەی لەخوا بترسێت بەبەزەیی دەبێت، ئەوەی تێگەیشتوو بێت زانایە، ئەوەی بینایی ڕۆشن بێت تێگەیشتووە.

٥٥- ئەی کوڕی شیرینم: کاتێ چوویتە ناو کۆڕو کۆمەڵێکەوە تیری سەلامیان تێبگرە( سەلامیان لێ بکە) پاشان لەسوچێکەوە دابنیشە، قسە نەکەیت تا ئەوان دەست دەکەن بەقسەکردن، ئەگەر قسەکانیان باش بوو ئەوا تۆش بەشداربە لەگەڵیان بەڵام ئەگەر قسەکانیان خراپ بوو ئەوا هەستەو ئەو جۆرە کۆڕو کۆمەڵە بەجێبهێڵە.

٥٦- کوڕی خۆم: دڵخۆش مەبە بەکردەوەکانت ئەگەر چی زۆریش بێت، چونکە تۆ نازانی ئایا خوای گەورە لێی وەرگرتووی یان نا.

٥٧- ڕۆڵە گیان: لەماوەی تەمەنی ڕابردوومدا ئەوە فێر بووم‌و دڵنیابووم کە خوای گەورە هەر بەڵاو تاقیکردنەوەیەك کە بەرەورووی بەندەیەکی دەکاتەوە ئەوا خێرێکی تیایە یان بەڵایەکی گەورەتری پێ لادەبات کوڕەکەی وتی: باوکە گیان ڕێزێکی زۆرم بۆ تەمەن‌و ئەزمون‌و پەندەکانت هەیە، بەڵام من هەرچی ئەکەم تێناگەم چۆن ئەگەر تەشی نارەحەتییەك ببم خێری تیایە، یان ئاخۆ ئەبێت چی بەڵایەك لەوە ناخۆشتر بێت تا دڵمان بەوە خۆشبکەیت کە خوای گەورە دووری خستۆتەوە لێمان؟!

لوقمان ووتی: ڕۆڵە نازانم چۆن تێت بگەیەنم بەڵام بەهەر حاڵ باشترین چارەسەر ئەوەیە، لەفڵان شار هەرچەندە دوریشە یەکێك لە پێغەمبەرانی خوا لەوێ بانگەواز بۆ ئاینی خوا دەکات، واباشە بچین بۆلای ئەو پێغەمبەرە تا بۆمان ڕونبکاتەوەو تێمان بگەیەنێت، کوڕەکەی ووتی: جا باوکە گیان تۆ لەگەڵم دێیت بۆئەو شارە دوورە؟!

لوقمان ووتی: بەڵێ، چۆن حەز ئەکەی باوابێت جگەر گۆشەکەم.

لوقمان‌و کوڕەکەی خۆیان کۆکردەوەو ئامادەی سەفەر بوون‌و توێشووی پێویستیان ئامادەکرد لەنان‌و ئاوو هەریەکێکیان ئەسپێکی باشی زین کردوو کەوتنە ڕێ، بەڵام پاش سەفەرێکی چەند شەوو ڕۆژی کەبەتەواوەتی ماندوو بوون بەهۆی بڕینی ئەو ڕێیە

دورو سەختەوە کەچی هەر نەگەیشتنە جێو لەوەش ناخۆشتر بۆیان ئەوەبوو کە ئاوەکەیان تەواو بوبوو نانەکەشیان زۆر کەم بوبووەوە، گەرمای زۆر ماندووی کردبوونو تینویەتی زۆری بۆ هێنابوون، ئەسپەکانیان هاتن بەچۆکداو نەیانتوانی چیتر هەڵیان بگرن، بۆیە ناچاربوون ئەسپەکانیان لەو دەشتە بەجێبهێڵن، ماوەیەکی زۆریش بەپێ ڕێیان کرد بەڵام حاڵیان زۆر شلۆقو ناڵەبار بوو لە دوورەوە دوکەڵێ گەردەلولێکیان بەدی کرد، لوقمان بەکوڕەکەی ووت: ڕۆڵە ئەو دوکەڵە نیشانەی ئاوەدانییە پشتیوان بەخوا بەم نزیکانە پێی ئەگەین ئەوە شارەکەیە کە باسم کرد، بەم شێوەیە کەمێك هیوایان هاتەوە بەرو گوڕیان تێ هاتەوەو کەوتنە ڕێ بەرەو شارەکە بەڵام ئێسقانێکی زۆر تیژ کەلە زەوییەکەدا بەلاری کەوتبوو چەقی بە پێی کوڕەکەی لوقمانداو لەسەری پێیەوە دەرچوو ئەوەندەئازاری هەبوو لەهۆش خۆی چوو لەم کاتەدا لوقمان وەك باوکێکی دڵسۆزو بەسۆز زۆر ناڕەحەت بوو.. بەددانەکانی ئێسقانەکەی لە پێی کوڕەکەی دەرهێناو پاشان پارچەیەك قوماشی لە مێزەرەکەی سەری کردەوەو قاچی کوڕەکەی پێ پێچاو سەری کوڕەکەی خستە سەر ڕانیو دەستی کرد بەگریان، لەم کاتەدا چەند دڵۆپە فرمێسکێکی گەرم کەوتە سەر ڕوومەتی کوڕەکەی، بۆیە کوڕەکەی بەناگا هاتەوەو چاوی هەڵبڕیو بینی وا باوکی زۆر بێتاقەتەو ئەگری، وتی: ئای باوکە ئەوە تۆیت وا بێتاقەت بوویتو ئەگری؟! مەگەر تۆ نەتوت هەر بەڵاو ناڕەحەتییەکە بێت بەسەر مرۆڤدا ئەوا خێری تیایە یان لەوانەیە خوای گەورە بەڵایەکی تری لێ لابدات؟! ئەی ئیتر تۆ بۆچی ئەگریتو بێتاقەتی؟!

باوکی ووتی: ڕۆڵە گیان بۆتۆ ئەگریمو خەفەت بۆتۆ ئەخۆم کە قاچت تووشی ئەم ئازارە بووە ئێستاش سورم لەسەر ئەم قەناعەتەی خۆم کە ئەم بەڵاو تاقیکردنەوەیە خێری تێدایە لەوانەیە لەبەڵایەکی گەورەتر ڕزگارمان بوبێت ئەوا شارەکە نزیکەو وردە وردە ئەڕۆین خوا گەورەیە، ڕۆڵە گیان بابکەوینە ڕێ..

لەم کاتەدا لوقمان تەماشای کرد هیچ نیشانەیەکی ئاوەدانیو دوکەڵی بەدی نەکرد سەری سوڕماو بەکوڕەکەی وت:

ڕۆڵە بەخوا سەیرە، خۆ هیچ شتێك بەدی ناکەم، ئەوەچییە؟!

لەم کاتەدا کە لوقمان کوڕەکەی ئەبلەق ببونو نەیان دەزانی چی بەدی بکەن، لە دورەوە ئەسپ سوارێکیان بینی کە زۆر بەخێرایی غاری دەکردو دەڕۆیشتو جلێکی سەرتاپا سپی لەبەردابوو لەدورەوە بانگی کرد تۆ لوقمانی؟

لوقمان بەسەر سوڕمانێکەوە وتی: بەڵێ من لوقمانم ئەسپ سوارەکە ووتی: کوڕەکەت چۆنە؟ ئەوە باسی چی دەکات؟!

لوقمان ووتی: تۆ کێیت؟ من تۆ ناناسمو ناتبینم!

ئەسپ سوارەکە ووتی: من(جبریل)م من تەنها پێغەمبەرێکی گەورە یان فریشتەیەکی نزیك لەخواوە نەبێت نامبینێت ئەگەر وا نەبوایە دەتبینیم.

لوقمان وتی: دەزانی کوڕەکەم باسی چی کردووە

(جبریل) وتی: نازانم کوڕەکەت باسی چی کردووە بەڵام من زۆر لەخوا پاڕامەوە کە بنانپارێزێتو نەگەنە ناو ئەم شارە، چونکە خوای گەورە منی نارد ژێراو ژوررو وێرانم کرد چونکە سەرپێچی پێغەمبەرەکەیانکرد.

لوقمان وتی: باشە چۆن ڕزگارمان بوو؟

جبریلوتی: پاڕامەوەو داوام لەخوای گەورە کرد کە توشی شتێکتان بکاتو بەهۆی ئەوەوە دوابکەونو نەچنە ناو شارەکە، ئەگەر نا ئێوەش وەکو خەڵکی ئەو شارەو دەوروبەری لەناودەچوون، وادیارە برینداربوونی قاچی کوڕەکەت دوای خستنو ڕزگارتان بوو، تۆش بەنیەتی شیفا دەست بێنە بەقاچی کوڕەکەتداو ناوی خوا بەسەر خواردنو خواردنەوەکاندا بخوێنە خواش بەرەکەتی تێ دەخاتو بگەڕێنەوە بۆ شارەکەی خۆتان(جبریل) ئەمەی وتو لەبەرچاو ونبوو کوڕەکەی (لوقمان) وتی:

بەخوا باوكە سەیرە!! باش بوو تێكەڵ بەخەڵكی ئەو شارە نەبووین ئەگینا ئێمەش لەناوئەچووین.

لوقمان وتی: ئەها كوڕی خۆم.. بەچاوی خۆت بینیتو بەگوێی خۆت بیستت كە خوا چۆن بەزەیی پیاماندا هاتەوە، دەزانی ئەگەر مرۆڤ لەكاتی خۆشیدا خوای لە یادبێت ئەوا لەكاتی ناخۆشیدا خوای گەورە یادی دەكاتو بەهانایەوە دەچێت، خوای گەورە جڵەو شل دەكات بۆ ستەم كاران بەڵام لە یادیان ناكات كەكاتی خۆی هات لەناویان دەبات.

كوڕم ئەوەش بزانە.. ئێمە موسوڵمانینو بەندەی خواین.. دەبێت ڕازی بین بەهەموو ئەو قەزاو قەدەرانەی كە خوای گەورە دەیهێنێتەڕێمان ئەوە هەمووی خێرەو پاداشتی لەسەر وەردەگرین..

كوڕەكەی وتی: باوكە گیان ئێستا ڕاستی قسەكانتم بۆ دەركەوتو تێگەیشتم پشت بەخوا لەقسەكانی تۆ دەرناچم.

٥٨- ڕۆڵەكەم: دەزانی خراپترین كەس كێیە؟

ئەو كەسەیە كە بەلایەوە گرنگ نیە خەڵك ناوزڕاوبیۆ بەخراپی بزانن، ئاسایە بەلایەوە لەبەرچاوی خەڵكی كاری خراپ ئەنجام بدات.

٥٩- كوڕەكەم: كاری چاكە بكەو وریای خراپە بە بەچاكە خراپە ئەكوژێتەوە، ئەگەر ئەو قسەیە ڕاستە ئاگر لای ئاگر بكەرەوە بزانە ئایا دەیكوژێنێتەوە؟!

بەڵام خراپە بەچاكە دەكوژێتەوە هەروەك چۆن ئاگر بەئاو دەكوژێتەوە.

٦٠- كوڕەكەم: بەكەم ڕازی بە، قەناعەتت بەبەشی خۆت بێتو چاوت لەماڵی خەڵكی نەبێت چونكە ئازارت ئەدات.

٦١- كوڕەكەم: زمان كلیلی چاكەو خراپەیە،دە تۆش زمانت مۆرێكی لێ بدە هەروەك چۆن مۆر لە زێرو زیو دەدەیت، تەنها بۆ چاكە زمانت بەكاربێنە.

٦٢- کوڕی خۆم: سەربەرزی بۆ ئەوەی دنیا سەر لێ نەشێواندو لەخۆی بایی نەبوو ڕۆژی قیامەت پەشیمان بێتەوە.

٦٣- ئەی کوڕی خۆم: یەکەم شت کەبەکەڵکت بێتو ڕزگارت بکات دوای باوەڕ بەخوا هاوڕێی چاکە، بەڕاستی هاوڕێی چاك وەك دارخورما وایە، یان لە سێبەرەکەی دائەنیشی، یان لەبەرە شیرینییەکەی ئەخۆی یان سوود لەلقەکانی وەرەگریت.

٦٤- کوڕی خۆم: گوێڕایەڵی خوا وەك بازرگانی وەربگرە قازانجێکی زۆر دەکەیت بەبێ کەلوپەل لەخوا بترسە، با خەڵکی وا تەماشات نەکەن کە تۆ لەخوا ئەترسی تا ڕێزت لێ بگرنو دڵیشت بێئاگابێت.

٦٥- کوڕی خۆم: ئومێدت ئەوەندە بەخوا هەبێت کەلە سزای ئەمین نەبی، ئەوەندەش لێی بترسە کەلە بەزەیی‌و ڕەحمەتی نائومێد نەبی، وتی: باوکەگیان چۆن ئەتوانم ئەوە بکەم لە حاڵێکدا کە من دڵێکم هەیە؟

وتی: کوڕی خۆم بەڕاستی مرۆڤی باوەڕدار خاوەنی دوودڵە، دڵێك کە ئومێدی بەخوایە دڵێکیش کە ترسی لەخوایە.

٦٦- کوڕی شیرینم: بەڕاستی نمونەی ئەوانەی کە یادی خوا ئەکەنو ئەوانەی کەیادی ناکەن وەك ڕوناکی‌و تاریکی وایە.

٦٧- کوڕم: ئاوات بەکەسێك مەخوازە کە خوێنی باوەڕداران ئەڕێژێت، ئەو کەسە لای خوا بکوژێکی بۆ هەیە کە نامرێت.

٦٨- کوڕی خۆم: بۆ ئەوە زانست فێر نەبی کە خۆتی پیا ڕادەی بەسەر زانایانداو دەمەقاڵێی پێ بکەی لەگەڵ نەفامانداو خۆتی پێ دەربخەی لەناو کۆڕوکۆبونەوەکاندا، وازیش لە فێربوونی زانست مەهێنەلەبەر زوهت تیایداو حەزکردنت لەنەفامی.

٦٩- کوڕی خۆم: لەبەر سێ شت فێری زانست مەبەو لەبەر سێ شتیش وازی لێ مەهێنە، فێری مەبە بۆ ئەوەی دەمەقاڵەی پێ بکەی یان شانازی پێ بکەی یان خۆتی پێ

دەرفەتی وازیشی لێ مەهێنە لەبەر زوهدت بۆی یان شەرم کردنت لەخەڵکی یان ڕازی بونت بەنەفامی.

٧٠- کوڕی شیرینم: دەمە دەمێ لەگەڵ زانایاندا مەکە چونکە لەسەریان قورسەو متمانەت لایان نامێنێت دەمەدەمیش لەگەڵ نەزانانندا مەکە، چونکە کاری ناشیاوت بەرامبەر دەکەن و جوێنت پێ دەدەن بەڵکو ئارامبگرە بەرامبەر ئەوانەی کەلە زانستدا لەسەروو خۆتەوەن و ئەوانەشی کە لەخوار خۆتەوەن، چونکە کەسێك دەگات بەئاستی زانایان کە ئارامبگرێ بەامبەریان و هەمیشە لەگەڵیان بێ و بەنەرمونیانی زانستەکەیان لێ وەربگرێت.

٧١- کوڕەکەم: هەوڵی فێربوونی زانست مەدە لەسەر یەك تا کاردەکەی بەوەی کە فێری بویتە.

٧٢- کوڕی خۆم: هەوڵ بدە بەمنداڵی فێری زانست بە، چونکە فێربوونی زانست بەگەورەیی قورسە.

٧٣- کوڕی خۆم: با قسەت خۆش بێت و بارووت خۆش بێت، ئەو کاتە زۆر خۆشەویستتر دەبیت لای خەڵکی لەو کەسەی کە دەبەخشێت.

٧٤- کوڕی خۆم: پاکترین خواردن بخۆو لەسەر خۆشترین جێگاش بخەوە.

٧٥- کوڕی شیرینم: عەقڵی هیچ مرۆڤێك تەواو کامڵ نابێت تا دەشتی تیا نەبێت.

١-خۆ بەگەورەزانین لێی ئەمین بێت.

٢- ئومێدی زیرەکی لێ بکرێت.

٣- لە دنیادا هەوڵی بژێوی بدات و ئەوەی زیادبوو بیبەخشێت.

٤- خۆ بەکەم زانین لای خۆشەویستتر بێت لە ڕێزوگەورەیی.

٥- حەزی لەزەلیلی بێت زیاتر وەك لە عیزەت،

٦- بە درێژایی تەمەنی لە شارەزابوون لە ئاینی خوا بێزار نەبێت.

٧ - لەلای خۆیەوە لەداواکردنی پێویستی بێزار نەبێت.

٨ - چاکەی کەمی خەلکی بەزۆر بزانێت.

٩ - چاکەی زۆری خۆشی بەکەم بزانێت.

١٠ - کەلە هەموویان گەورەترو گرنگتر ئەوەیە کە وابزانێت هەموو خەلکی سەر زەوی لەو چاکترن‌و خۆشی لە هەموویان خراپترە ئەگەر چاکەی لەکەسێك بینی پێی دلخۆش بێ‌و ئاواتی بێت پێی بگات، ئەگەر خراپەی لەکەسێکیش بینی بلێ: ئایا ئەم کارە خۆت‌و کەسوکارت سەرفرازو رزگار دەکات ئەمەش کاتێ دەبێ کە عەقلێ تەواو و کاملێ بوبێت.

٧٦- کوڕی شیرینم: یەکەم شت کە پێویستە لەسەرت ئاگات لێی بێت نەفستە، بەراستی هەموو نەفسێك ئارەزووی هەیە، ئەگەر گوێت بەئارەزووەکانت نەدا ئەوا سنور دەبەزێنێت، بەراستی شەهوەت‌و ئارەزوو لە دلدا شاراوەیە وەك شاراوەیی ئاگر لە بەرددا، ئەگەر دابگیرسێت دەردەکەوێ‌و ئەگەر داشنەگیرسێت هەرشاراوەیە.

٧٧- کوڕی شیرینم: کاتێ سەفەر دەکەی وریابە لەسەرولاخەکەت خەوت لێ نەکەوێت چونکە زۆر خەوتن بەسەر ولاخەوە دەبێتە هۆی بەربونەوەت لەسەری ئەگەر لە شوێنێك لاتدا لەوەڕی باشبوو لێی گەڕێ با تێربلەوەڕێت، ولاخەکەت لە پێش خۆتدا تێرو پاراو بکە،ئەگەر سەفەرەکەت دورو درێژ بوو لەشەودا بکەوەڕێ چونکە لەشەودا ڕێگە کورت دەبێتەوە،ئەگەر لە ڕێگە لاتدا بۆ پشوو لە قەراغ ڕێگە لامەدە چونکە شوێنی مارو دڕندەیە،لە شوێنێك لابدە کە خۆش بێ و گلەکەی نەرم بێ و لەوەڕی زۆر بێ،کاتێ لە سواری ولاخەکەت دائەبەزی بۆ پشوودان پێش ئەوەی دابنیشیت دوو ڕکات نوێژ بکەو ئینجا بلێ:خوایە لە شوێنێکی پیرۆز دامبەزێنە ،ئەگەر ویستت خۆت خالی بکەیتەوە لە دوری ڕێگە دابنیشەو خۆشت داپۆشە کاتێ

ئەو شوێنەش بەجێ دێڵی دوو ڕکات نوێژ بکەو سەلام لەو خاکەو دەوروبەری ئەو شوێنەش بکە،چونکە هەموو خاك و زەوییەك فریشتەی لێیە.

کاتێ ویستت بە لای دەشتێك یان دۆڵێك یان چیایەکدا تێپەڕی زۆر یادی خوا بکە،چونکە دەشت و چیاکان هەندێکیان بانگی هەندێکیان دەکەن و دەڵێن :ئایا ئەمڕۆ کەسێك بە لاتاندا تێپەڕیوە یادی خوای کردبێت؟

ئەگەر توانیت نان نەخۆیت تاخێری لیَ دەکەیت بیکە،هەر کاتێ لەسەفەردا بوویت یادی خوا بکە،ئەگەر بەڕۆژو بوویت تەسبیحات بکە،ئەگەر بەتەنیا بوویت دوعاو نزا بکە نەکەی لەسەرەتای شەودا بکەویتە ڕێ بۆ سەفەر هەوڵبدە لە ناوەڕاستی شەوو کۆتاییەکەیدا لە ڕێگە پشوو بدەیت.

نەکەی لە کاتی سەفەردا دەنگ بەرز بکەیتەوە مەگەر بۆ زکرو یادی خوا،با لە سەفەردا شمشێرو کەوانەت پێبێ و دەرمانیش لەگەڵ خۆت بە بۆ ئەوەی هاوسەفەرە نەخۆشەکانت سوودی لێ ببینن،لەگەڵ هاوسەفەرەکانتدا لە هەموو شتێکدا لەگەڵیاندا کۆك بە کە لە خوات نزیك بخاتەوەو لە تاوانت دوور بخاتەوە،ڕووخۆش بە لەگەڵیاندا،ئەگەر شتێکیان پێویست بوو بەشیان بدە،کاتێ بانگیان کردی وەڵامیان بدەرەوە،کاتێ داوای یارمەتیان لیَ کردی یارمەتیان بدە،کاتێ داوای شایەتی حەقیان لێ کردی شایەتیان بۆ بدە بیروڕات لەگەڵیان ئاڵوگۆڕبکە،ئەگەر بینیت ئەڕۆن تۆش لەگەڵیان برۆ، یان ئەگەر ئیشێکیان ئەکرد یارمەتییان بدە، ئەگەر شتێکیان بەخشی تۆش لەگەڵیان ببەخشە، گوێ لەکەسانی لەخۆت گەورەتر بگرە، ئەگەر ڕێگەتان لێ تێکچووبوەستن ئەگەر دوودڵ بوون لەمەبەستی سەفەرەکەتان ڕاوێژبکەن.

٧٥- کوڕی خۆم: بەڕاستی چڵەپۆپەو لوتکەی گەورەیی و ڕێز لەدونیاو دوارۆژدا عەقڵی چاکە، کاتێك بەندە عەقڵی چاكو جوان ئەبێت هەموو ناتەواوییەکانی بۆ

نەپۆشیی و یەکسانی بەرپادەکات و پەروەردگاریشی لێ ڕازی دەبێت، مرۆڤ ئەوەندەی لە عەقڵ بەسە کە خەڵکی لەخراپەی بێوەی بن.

٧٩- کوڕەکەم: ئەگەر لالێکی ژیر بیت چاکترە لەوەی قسەکەرێکی نەزان بیت، هەموو شتێك بەڵگەی هەیە بەڵگەی ڕێنیشاندەریش هەڵسوکەوتە بەڵگەی هەڵسوکەوتیش بێدەنگییە، ئەوەندە نەفامیت بەسە خەڵکی لە شتێك قەدەغە بکەیت خۆشت بیکەیت.

٨٠- کوڕی شیرینم: تکایە خۆت لەزۆر خۆری بپارێزە چونکە زۆرخۆری نزیك لەنزیك دوردەخاتەوەو دانایی ناهێڵێت.

٨١- کوڕی خۆم: خۆت لەتوڕەیی بپارێزە، چونکە بەڕاستی توڕەیی لەناوبەری دڵی مرۆڤی بەڕێزە.

٨٢- کوڕی خۆم: خۆت لەتەمەڵیو بێزاری بپارێزە چونکە ئەگەر تەمەڵ بیت هیچ مافێکت پێ نادرێ، ئەگەر بێزاریش بیت لەسەر حەق ئارام ناگری.

٨٤- کوڕی شیرینم: خۆت لەخراپە بپارێزە ئەویش خۆی لێت بە دوور ئەگرێت، چونکە خراپە بۆ خراپە دروستکراوە.

٨٥- کوڕی خۆم: با تەنها پارێزکاران نانت بخۆن، لە کارەکانیشتدا ڕاوێژ بەزانایان بکە.

٨٦- کوڕی خۆم: من هەرگیز لەسەر بێدەنگی پەشیمان نەبوومە، چونکە ئەگەر قسەکردن زیو بێت بێدەنگی زێرە.

٨٧- کوڕی خۆم: ئاگات لەدەریا بێت کاتێك کە زۆر دەبێت، ئاگاشت لەپاشابێت کاتێك توڕە ئەبێت.

٨٨- کوڕی خۆم: ڕێگری لەوە بکە کەلە زارت دەردەچێت، پێویستە لەسەرت قسەیەك بکەیت کە سودت پێ بگەیەنێ.

٨٩- کوڕە ئازیزەکەم: هەر کاتێك نوێژهات لەبەر هیچ هۆیەك دوای مەخە، نوێژەکەت بکەو پشوویەك بدە چونکە نوێژ قەرزە لەسەرت، بەجەماعەت ئەنجامی بدە ئەگەر چی بەژێر ڕمیشەوە نوسابیت.

٩٠- کوڕیخۆم: کاتێك داوای شایەتیت لێکرا شایەتی بدە، کاتێك داوای یارمەتیت لێکرا یارمەتی بدە، کاتێ ڕاوێژت پێکرا پەلە مەکە تا سەرەنجامی کارەکە دەبینیت.

٩١- کوڕی خۆم: پیاو هەیە قسەیەك دەکات تا پێی دەوترێت گێل گێلیش نیە، پیاو هەیە بێدەنگیش دەبێت تا پێی دەوترێت ئارامگر ئارامگریش نییە.

٩٢- کوڕی شیرینم: کەسی نەفام مەکە بەنوێنەر ئەگەر کەسی زیرەکت دەست نەکەوت ئەوا خۆت ببە بەنوێنەری خۆت.

٩٣- کوڕی خۆم: لەناوهاوەڵەکانتدا واخۆت نیشان بدە کە پێویستت پێیان نیە.

٩٤- کوڕی خۆم: کەسێك قسەبکات بۆ کەسێك کەگوێ لەقسەکانی نەگرێت، وەك ئەوەیە خواردن پێشکەش بەئەهلی گۆڕستان بکات.

٩٥- کوڕی خۆم: کەسی شایستە لەفێربوونی زانست قەدەغە مەکە زیاتر گێل دەبێت.

٩٦- کوڕی خۆم: خۆت لەخراپە بپارێزە وەك چۆن ئەو خۆی لێت ئەپارێزێت.

٩٧- کوڕی خۆم: پێش ئەوەی نەخۆش بکەویت بچۆ بۆلای پزیشك، واتە:(فریای هاوەڵەکانت بکەوە پێش ئەوەی پێویستت پێیان بێت).

٩٨- کوڕی خۆشەویستم: ئەگەر گومانت لەمردن هەیە مەخەوە، تۆهەر وەك چۆن دەخەویت دەشمریت، ئەگەر گومانت لەزیندوبوونەوەش هەیە لەخەو هەڵمەستە، هەر وەك چۆن لەخەو هەڵدەستیت لەدوای مردنیش زیندوو دەکرێیتەوە.

٩٩- كوڕی خۆم: خۆت لەهاوسەری خراپ بپارێزە چونكە پیرت دەكات پێش كاتی پیربوونت خۆت لەئافرەتانی خراپ بپارێزە، چونكە ئەوان هەرگیز بۆ چاكە بانگت ناكەن.

١٠٠- كوڕی خۆم: بەڕاستی ئاڵتوون بەئاگر تاقیدەكرێتەوە، بەندەی چاكیش بەبەڵاو ناخۆشی تاقی دەكرێتەوە، خوای گەورە هەركاتێ كۆمەڵێكی خۆش بوێت تاقیان دەكاتەوە هەر كەس ڕازی بێت خواش لێی ڕازی دەبێت، هەر كەسێكیش ڕازی نەبێت خواش لێی ڕازی نابێت.

١٠١- كوڕی خۆم: هەموو كەسێك سەگی خۆی هەیە تۆش مەبە بەسەگی هاوەڵەكانت.

١٠٣- كوڕی خۆم: ڕژدیوڕەوشتی ناشرینو زۆر داواكردنی شت لە خەڵكی نیشانەی نەفامییە.

١٠٤- كوڕی خۆم: هەر كەسێك نهێنی خۆی بشارێتەوە جڵەوی كارەكانی هەمووی لەدەستی خۆیدایە.

١٠٥- كوڕی شیرینم: خۆت لەدرۆ بپارێزە، چونكە بەڕاستی درۆ مرۆڤ وەك گۆشتی چۆلەكە حەزی لێدەكاتوكەم كەس قێزەونە بەلایەوە.

١٠٦- كوڕی خۆم: زانست شتێكی باشە بەڵام لەگەڵ ئارامگرتندا چاكترە، بێدەنگیش چاكە بەڵام لەگەڵ دارایی دا چاكترە.

١٠٧- كوڕی شیرینم: بەڕاستی زمان كەڵبەی جەستەیە وریابە لەوەی كەشتێك لەزمانتەوە دەربچێتو جەستەت لەناو ببات، یان پەروەردگارت توڕە بكات.

١٠٨- كوڕی خۆم: ئەگەر مرۆڤی دانا هەركاتێ پێت گەیشت بەدارعەصاكەی لێیدای چاكترە لەمرۆڤی نەفام ئەگەر چی پێشت گەیشت دڵخۆشت بكات.

۱۰۹- کوڕی خۆم: ئەگەر مرۆڤی بەئارام زیانیشت پێبگەیەنێ چاکترە لەوەی مرۆڤێکی گێل چەورت بکات.

۱۱۰- کوڕی خۆم: مرۆڤ سێ سێیەکە، سێیەکی بۆ خوایە، سێیەکی بۆ خۆیەتی، سێیەکی بۆ کرمە، ئەوسێیەکەی کەبۆ خوایە ڕۆحەکەیەتی‌و ئەو سێیەکەی بۆخۆیەتی کاروکردەوەکانییەتی‌و ئەو سێیەکەی بۆ کرمە لاشەکەیەتی.

۱۱۱- کوڕی خۆم: بەڕاستی دانایی ئەوەیە هەشت شت بکەیت.

۱- دڵی مردوو زیندوو بکەیتەوە.

۲- لەگەڵ هەژار دابنیشیت.

۳- لەگەڵ پاشادا دانەنیشیت.

٤- یارمەتی لێقەوماو بدەیت.

٥- کۆیلە ئازاد بکەیت.

٦- داڵدەی ڕێبوار بدەیت.

۷- یارمەتی هەژار بدەیت.

۸- ڕێز بۆ کەسی بەڕێزو گەورەیی بۆ کەسی گەورە زیاد بکەیت، کە ئەوە چاکترە لەماڵو پاراستنە لەترس توێشووە لەشەڕداو، کەلوپەلی بازرگانییە لەکاتی شەڕکردنداو، ئەوە تکاکارە لەکاتی ڕووبەڕووبونەوەی پێشهاتۆ ناخۆشییەکانداو،ڕێنتیشاندەریشە کاتێك دەروون پڕ دەبێت لە دڵنیایی‌و باوەڕو، داپۆشەریشە بۆی لەکاتێکدا کەجل دایناپۆشێت.

۱۱۲- کوڕی شیرینم: شەرم لەخوابکە بەو ئەندازەیەی کەلێوەی نزیکی، لەخوا بترسە بەو ئەندازەیەی کە دەسەڵاتی بەسەرتدا هەیە، خۆت لەزیادەڕۆیی بپارێزە، چونکە لێپرسینەوەی سبەینێت زۆر وردە، باخوای گەورە لەشوێنێك نەتبینێت کەنەهی لێکردووی لەوێ بیت، بالەشوێنێك بتبینێت کەفەرمانی پێکردوویت لەوێ بیت.

١١٣- کوڕی خۆم: لەکۆڕو کۆبونەوەدا لەشوێنی بەرز دامەنیشە، چونکە شوێنی نزم چاکترە لەشوێنی بەرز.

١١٤- کوڕی خۆم: لەبەر خوا خەڵکت خۆش بوێو هەر لەبەر خواش ڕقت لەخەڵکی بێت، با گوناهباران چەورت نەکەن.

١١٥- کوڕی شیرینم: بەخۆشەویستیت لەدۆستانی خوا لە خوا نزیك بەرەوە، بەڕق ونیشت لەگوناهباران لەخوا نزیك بەرەوە.

١١٦-کوڕی خۆم: دنیا خێری تیانییە تەنها بۆدووجۆر کەس نەبێت، کەسێك گوناهو تاوانی هەیە بەڵام ئێستا تەوبەی کردووەوئەیەوێت بەکاری چاکە بیسڕێتەوە بەڵکو خوای گەورە لەگوناهەکانی ڕابردووی خۆش بێت کەسێکیش هەر کاری چاکە ئەنجام دەدات‌و داوای پلەی بەرزتر دەکات، کارەچاکەکانی لەخۆی بایی ناکەن ئەگەر چی زووریش بن چونکە نازانێت ئایا خوای گەورە لێی وەرگرتووە یان نا.

١١٧- کوڕی خۆم: زۆر باسی خەڵکی مەکەو مافیشیان مەخۆ، ستەمکار مەبەو خوشت لەدوعای ستەم لێکراو بپارێزە.

١١٨- لوقمانی حەکیم لەسەرە مەرگدا ئامۆژگاری کوڕەکەی دەکردوو دەیوت: من زۆر ئامۆژگاریم کردووی، بەڵام ئێستا ئامۆژگارییەکت دەکەم کە شەش خاڵە هەموو زانست لەمەدا کۆبۆتەوە.

یەکەم: خۆت سەرقاڵ مەکە بەدنیاوە مەگەر بەو ئەندازەیەی کە تیایدا دەمێنێتەوە.

دووەم: پەروەردگارت بپەرستە بەو ئەندازەیەی کە پێویستت پێیەتی.

سێیەم: هەوڵ بۆ دوارۆژبدە بەو ئەندازەیەی کەتیایدا دەمێنیتەوە.

چوارەم: با هەوڵدانت بۆ ئاگری دۆزەخ بەو ئەندازەیەی تێگەیشتنی خۆت بێت کەدڵنیای ڕزگاربوون نییە لێی.

پێنجەم: با جورئەتو بوێریت لەسەر تاوانکردن بەئەندازەی ئارامگرتنت بێت لەسەر ئاگری دۆزەخو سزای خوا.

شەشەم: کاتێك ویستت گوناهێك بکەیت لەجێگەیەکدا بیکە کە خواو فریشتەکانی نەتبینن.

١١٩- کوڕی شیرینم: ئامۆژگاریست دەکەم بەدوو شت کە بەردەوام دەستیان پێوەبگریت، پارە بۆبژێوی ژیانت، دینداری بۆدوارۆژت.

١٢٠- کوڕی شیرینم: لەسەر ئەژنۆ برۆ بۆلای زانایان، دەمەقاڵەیان لەگەڵدا مەکە رقت لێ هەڵدەگرن، بەئەندازەی پێویستی خۆت هەوڵ بۆ دنیا بدە، زۆر هەوڵ بدە بۆ دوارۆژت هەموو دنیا بەیەکجاری پشت گوێ مەخە باهەژار نەبیتو ببیتە بار بەسەرشانی خەڵکییەوە.

رۆژوویەك بگرە کەئارەزووەکانت تێك بشکێنێت، رۆژوویەك مەگرە کەزیان بەنوێژەکانت بگەیەنێت چونکە نوێژ چاکترە لەرۆژوو، وەك باوك وایە بۆهەتیو، وەك مێرد وایە بۆ بێوەژن، بەخزمەوە مەدە وەك مار، لەگەڵ نەفام دامەنیشە، هاوەڵێتی دوورو مەکە.

١٢١- کوڕی خۆم: چاوەڕێی خۆشەویستی نەفام مەکەکەوا ببینێت تۆ لەکارەکانی رازیت، ئاگات لەتوڕەیی‌و رقی ژیرو دانابێت.

١٢٢- کوڕی خۆم: چاوەڕێی سوپاسی خەڵکی مەکە باسەرزەنشتیشت نەکەن، وەك ئەو کەسە وابە کەبەردەوام هەوڵی خۆی دەداتو خەڵکیش بێوەین لێی.

١٢٣- کوڕی خۆم: بەدانایی لەگەڵ نەفامدا قسە مەکە بەدرۆت دەخەنەوە، بەنەفامانەش قسە لەگەڵ دانایاندا مەکەرقت لێ هەڵدەگرن.

١٢٤- کوڕی خۆم: کاتێك پێویستیت بەدەسەڵاتدار بوو سوور مەبە لەسەری‌و داوامەکە مەگەر لەکاتی خۆشی‌و دڵ ئارامیدا، داوای یارمەتی لەکەسێك مەکە کە

فیلّت لیّ دەکات، داوا لەچروکیش مەکە، چونکە ئەگەر نەتداتیّ گاڵتەت پیّ دەکات، ئەگەر بشتداتیّ منەت دەکات بەسەرتدا.

١٢٥- کوڕی خۆم: داوای لیّبوردن لەکەسیّك مەکە کە حەزنەکات داوای لیّبوردنی لیّبکەیت، داوای یارمەتیش لەکەسیّك مەکە کەحەز ناکات پێویستیت بۆ جیّبەجیّ بکات.

١٢٦- کوڕی خۆم: کەسیّك ئارامبگریّت لەسەر ناڕەحەتی خەڵکی ئەبیّت بەگەورەیان.

١٢٧- کوڕی خۆم: پیاوترین و بەڕەوشتترین کەس کەسێکە کاتیّ پێویستی هەبیّت دوور دەگریّت، کاتێکیش داوای پێویستی لیّبکریّت نزیك دەبیّتەوە.

١٢٩- کوڕی شیرینم: هیچ دەوڵەمەندییەك وەك لەشساغی نییە، هیچ نیعمەتێکیش وەك بەختەوەری نییە.

١٣٠- کوڕی خۆم: بەڕاستی خەڵکی بەڵێنی زۆریان بینیوەوبەپەلەش ئەڕۆن بەرەو دوارۆژ تۆش ماوەیەکە پشتت لەدنیاکردووەو ڕووت لەدوارۆژ کردووە، بەڕاستی ئەم خانوو ماڵەی تۆ دەڕۆیت بۆلای نزیکترە لیّتەوە لەو خانوو ماڵەی لیّی دەردەچیت.

١٣١- کوڕی خۆم: من چەند ئاکۆژگارییەکت دەکەم کە ئەگەر تۆ دەستیان پیّوە بگریت هەمیشە گەورەو پیّشەوا دەبیت، ئارامگربە بۆ نزیك و بۆ دوور ڕوخسارت بگرەوە لەبەخشندەو چروك سەردانی خزمانت بکە، با هاوەڵەکانت ئەوانەبن کاتێك لیّیان جیا دەبیتەوە یان لیّت جیادەبنەوە ڕەخنەت لیّناگرن.

١٣٢-کوڕی خۆم :پێویستە کەسی ژیر لە چوار کاتدا خۆی بناسیّت (١)کاتێك کە موناجاتی پەروەردگاری

تیا دەکات .(٢)کاتیّ کە لیّپرسینەوەی خۆی تیا دەکات.(٣)کاتێك کە بژیوی ژیانی تیا پەیدا دەکات .

(٤)كاتێك لە نێوان خۆی و خۆشيەكانی ئەوكاتەدا بەوە لە هەموو كاتەكاندا داوای يارمەتی تيا بكات.

١٣٣- ئەی كوڕی شيرينم: كەسی حەسود سێ نيشانەی هەيە: (١)ئەگەر هاوەڵەكەی لە لای نەبێ غەيبەتی دەكات ،(٢)ئەگەر لە لای بێت ماستاوی بۆ دەكات،(٣)لە كاتی ناخۆشيدا سەرە خۆشی لێ دەكات.

١٣٤-كوڕی شيرينم: فەرمان بكە بە چاكە و ڕێگری بكە لە خراپە و ئارامبگرە لە سەر ئەو شتانەی كە توشت دەبن، بەلاّ بەكەم بزانەو ،لێپرسينەوەی خۆت بكە پێش ئەوەی لێپرسينەوەت لە گەڵ بكرێت و هەڵخليسكان بناسە،چونكە ئەگەر هەڵخليسكانت ناسی لە ژيانتدا كەمتەرخەمی ناكەيت .

١٣٥-كوڕی شيرينم: هەركەسێ دەمەقاڵێ كەم بكات بێوەی دەبێت ،هەركەسێكيش زيادە ڕۆی تێدا بكات تاوانبار دەبێت،هەق و ڕاستی بڵێ ئەگەر زەرەری خۆشتی تيا بوو،گوێ بە تورە بونی كەسيش مەدە.

١٣٦-ئەی كوڕی ئازيزم: خواردنت كەم بكەرەوەو خۆت بە دانايی و حيكمەت پڕ چەكدار بكە.

١٣٧-كوڕی خۆم: پا بەندی دانايی بە پێی ڕێزدار دەبيت ،نرخی بزانە پێی گەورە دەبيت .

١٣٨-ئەی كوڕی خۆم: كارێك كە نازانی كەی دێت خۆتی بۆ ئامادە بكە پێش ئەوەی پێت بگات خوای گەورە:

ئامۆژگاری نەكردوم دەربارەی تۆو لە دەربارەی تۆ لێشم ڕازی يە.

١٣٩-كوڕی خۆم: ئەگەر بە منالّی ڕەوشت فێر بی كە گەورە بوی سودت پێ دەگەيەنێت.

١٤٠–کورِم: بەڕاستی دنیا کەمە لەو کەمەشدا تەمەنی تۆ کەمە ،بەڕاستی کەمێك لە کەمی کەمە کە ماوە!.

١٤١–کورِم: کردەوە ناتوانرێ ئەنجام بدرێت مەگەر بە دڵنیایی یەوە هەرکەسێك دلنیایی لاواز بوو کردەوەشی کەم دەبێت.

١٤٢–کورِم: ئەگەر لە بەرامبەر قسەکردندا شکستت هێنا لە بەرامبەر بێ دەنگیدا شکست مەهێنە،سور بە لە سەر ئەوەی گوێ بگری نەوەك قسە بکەی.

١٤٣–کورِی خۆم: خۆت لە پاڕانەوەی ستەم لێکراو بپارێزە چونکە نزیکترین شتە لە خواوە بۆ گیرا بوون.

١٤٤–کورِم:با گرنگی دانت بۆ شتێك بێت کە داوات لێ کراوە باگرنگی دانت بۆ شتێك نەبێت کە پێویستت نی یە،جا کەوایە زۆر گرنگی بە دنیا مەدە چونکە لە دوا رۆژ بێ ئاگات دەکات.

١٤٥–کورِی خۆم: با خۆشەویستی و رِق لێبونت لە بەر خوا بێ و لەگەڵ خراپەکارانیشدا نەرم و نیان مەبە.

١٤٦–کورِی خۆم: بسڵەمێوە لە یەك کەسیش مادام ئەو کەسە شایەنی لێ سڵەمینەوە و حەزەر لێ کردنە.

١٤٧–کورِم: ئەنجامدانی نوێژی فەرز چاکترە لە هەموو کارێك،بە ڕاستی نمونەی نوێژ و تەسبیحات وەك کەشتی وایە لە ناو دەریادا.ئەگەر کەشتی یەکە تیاچوو ئەوانەی ناویشی تیا دەچن.

١٤٨–کورِی شیرینم: کاتێك کە لای دەسەلاتدارێك دانیشتی با جێگەی کەسێك لە نێوان ئەو و تۆدا بمێنێتەوە ،نەوەك کەسێکی ئەو بێت و فیز بکات بە سەرتداو ببێتە ناتەواوی بۆ تۆ.

١٤٩-کورم: ئەگەر شەیتان لە ڕێی گومان و دوو دڵی یەوە بۆت هات،تۆ بە دڵنیایی و ئامۆژگاری بە سەریدا زاڵ بە،ئەگەر لە ڕێی تەمەڵی و بێزاری یەوە بۆت هات بە باسی قەبر و قیامەت بە سەریدا زاڵ بە،ئەگەر لە ڕێی هاندان و ترساندنەوە هات بۆت ،هەواڵی ئەوەی بدەرێ کە دنیاش کۆتای دێت.

١٥٠-کورم بە ڕاستی کەسی ڕەوشت ناشیرینی دەم شڕی بەد بەخت کاتێ کە قسە دەکات زمانی خۆی ڕیسوای دەکات و ئەگەر بێ دەنگیش بێت نەزانییەکەی ڕیسوای دەکات.ئەگەر کارێك بکات خراپە دەکات ،ئەگەر کارێکیش نەکات تەمەنی بە فیڕۆ دەڕوات.ئەگەر دەوڵەمەند بێت یاخی دەبێت،ئەگەر هەژاریش بێت نائومێد دەبێت،ئەگەر دڵخۆش بێت فیز دەکات ئەگەر خەمباریش بێت ئەبێتە دیل،ئەگەر ڕێزی بگری یاخی دەبێت، ئەگەر ڕێزی نەگری ڕەشبین دەبێت،ئەگەر داوا بکات سورە لە سەری ئەگەر داواشی لێ بکرێ نابەخشێ،ئەگەر پێ بکەنێت قاقا دەکات،ئەگەر بیشگری هاوار دەکات ،ئەگەر تورە بێت زۆر توندە،ئەگەر باسیشی بکرێت تورە دەبێت،ئەگەر ببەخشێ منەت دەکات ،ئەگەر پێی ببەخشرێ سپڵەیی دەکات،ئەگەر نهێنی لا دانرا خیانەتی لێ دەکات ،ئەگەر نهێنیشی لا دانای بوهتانت بۆ دەکات.

ئەگەر لە خوار تۆوە بو توانجت لێ دەگرێت،ئەگەر لە سەرو تۆشەوە بێ تورە دەبێت،ئەگەر هاوەڵێتی بکەیت ماندووت دەکات،ئەگەر لێشی دوور بیت وازت لێ ناهێنێ، نە دانایی نە زانست فێر بورنی یارمەتی نادەن،

مامۆستاکەشی دڵخۆش دەکات ،خێزانی دڵخۆش نی یە پێی ،خەفەتیشی بە سەریانەوە کەم ناکات،ئەگەر

لەوان دەوڵەمەندتر بێ لە خواریانەوەیە،ئەگەر لەوانیش هەژار تر بێت لە سەریانەوەیە ئەگەر ڕێنمایی بکرێ

ڕێنمایی وەرناگرێ،ئەگەر فەرمانی پێ بکرێت گوێڕایەڵی ناکات،ئەوەی لە گەڵی دەژی بەختەوەر نیە،ئەوەشی لێی دوورە لێی بێوەی نی یە،کاتێ قسە دەکات ناپێکێت،لە کاتی ناخۆشیدا ئارامگر نی یە،لە بابەتێکدا ناوەستێت ،کاری چاکە ئەنجام نادات،سوپاسی کەس ناکات واز لە فێڵ کردن ناهێنێت،لە کەسی سەرکەوتوو متمانەە وەرناگرێ ئەگەر چی لە گەڵ دانایانیشدا رێك نەبێ بە زانستەکەی لە خۆی بایی یە،ئەگەر یەکێك لە گەڵ زانایاندا بێت وادەزانێت ئەو چاکە کارە ،ئەگەر خراپە کاریش بێت وا دەزانێت بێ دەسەلآتی یەکەی زیرەکی یە خراپەکەی چاکەو زیادە ڕوییەکەی ورەیەو نەفامییەکەی ئارامگری یە،

حەزی لە چی بێت وەری دەگرێت،رقی لە چیش بێت وازی لێ دێنێت ئەگەر هەق و راستی لە گەڵ ئارەزویدا بوو ستایشی دەکات،خۆ ئەگەر هەقیش پێچەوانەی ئارەزوی بوو بە درۆی دەخاتەوە و وازی لێ دێنێت،کاتێك پێویستی و ئیشێکی بە هەق بوو پرسیاری دەکات،کاتێ پرسیاریشی لێ بکرێ وەلآم ناداتەوە ،کاتێ ئەهلی هەق ئامادە بون لە گەڵیانە،کاتێ ئامادەش نەبون ئەچێتە سەر ناهەق.

لە گەڵ زانایاندا دادەنیشێ ملکەچیان نیە و گوێیان لێ ناگرێت کاتێ لە ناو زانایانیشدا نەبێ فیز دەکات بە سەریانداو پێیان پێ دەکەنێ هەق دەڵێ بەلآم بە کردەوە پێچەوانەیەتی،فەرمان بەچاکە دەکات خراپەش ئەنجام دەدات،فەرمان بە هەق دەکات لە سەر ناهەقیشە هەموو جۆرە مامەڵەیەك لە گەڵ خەڵکیدا دەکات ئەگەر بۆ خۆی بێت پێی خۆش نیە چاکە پیشانی خەڵکی دەدات خۆی لێی دورە،رێگری لە خراپە دەکات خۆشی ئەنجامی دەدات ،فەرمان دەکات بەورە بەرزی لە خۆیدا نیە،لە شەرع خۆی شارەزا دەکات کاری پێ ناکات

بە کاری دوا رۆژ شوێن دنیا دەکەوێت.

ئەگەر بە هێز بێت توندە بەرامبەرت،ئەگەر لاوازیش بێ لاواز ترت دەکات ئەگەر دەوڵەمەندبێ پێت دەڵێ لە

خۆی بابی یە،ئەگەر هەژاریش بێ دەڵێ داماوە ئەگەر سور بیت لە سەر چاکە پێت دەڵێت ڕۆچووە،ئەگەر خاویش بێ پێت دەڵێ زۆر لە خۆی دەکات،ئەگەر پێی ببەخشی پێت دەڵێ زیادە ڕۆیی دەکات،ئەگەر نەشیدەیتێ دەڵێ چروکە ئەگەر نەرم بی لە گەڵی و لێی نزیك بیتەوە دەڵێ ماستاو چی یە ئەگەر لێشی دورە پەرێز بێ دەڵێ: فیز زلە.

١٥١-ئەی کوڕی خۆم:بەڕاستی لە ڕەوشتی دانای بەختەوەر:سەنگینی و ئارامی و چاکە و دادپەروەری و خۆراگری و ورە بەرزی و چاکە خوازی و زانست و کردەوەو وریایی و گورجی و پارێزکاری و لێبوردن و کردارو خۆ بە کەم زانینە،

ئەگەر قسە بکات بە زانست قسە دەکات، کاتێ کە بێ دەنگیش دەبێ ئارام دەگرێ ،ئەگەر ڕێزی لێ بگیرێ بە وەرع دەبێ ئەگەر ستەمیشی لێ بکرێ دەبورێ ئەگەر پرسیار بکات دوا ناکەوێ ،ئەگەر داوای لێ بکرێ چروکی ناکات،ئەگەرقسەی بۆ کرا تێ دەگات،ئەگەر زانا بێت خەڵکیش فێر دەکات،ئەگەر فێریش بوو جوان تێ دەگات،ئەگەر چاکەی بۆ بکرێ سوپاسی خاوەنەکەی دەکات،ئەگەر بشتوانێ چاکە بکات لە پێناوی خوادا دەیکات، ئەگەر لە گەڵ لە خۆی زاناتردا دابنیشێ پرسیاری لێ دەکات،ئەگەر لە گەڵ لە خۆی نەزان تریشدا دابنیشێت فێری دەکات،ئەگەر نهێنیت لا دانا خیانەتت لێ ناکات،ئەگەر نهێنیشی لا دانای دیارە متمانەی پێتە

ئەگەر شتی پێت بەخشی منەت ناکات بە سەرتدا،ئەگەر شتیشت پێ بەخشێ سوپاست دەکات.،چی بۆ خۆی پێی

حۆشه بۆ خه‌ڵكیش پێی خۆشه.له كاتی ده‌وڵه‌مه‌ندیدا زیاده‌ڕۆیی ناكات،له كاتی هه‌ژاریشدائارامگره به هۆی سامانه‌وه له خوا بێ ئاگا نابێت ،هه‌ژاریش له خوا بێ ئاگای ناكات،به زانسته‌كه‌ی سود ده‌گه‌یه‌نێت،
گوێ ده‌گرێت له هه‌ر كه‌سێك ئامۆژگاری بكات.
له گه‌ڵ سه‌رو خۆی موناقه‌سه ناكات وخوار خۆشی به كه‌م سه‌یر ناكات،داوای شتێك ناكات كه هی خۆی نه‌بێت،
ماڵ و سامانی به فیڕۆ نادات،شتێك ناڵێت كه نه‌یزانێت.ئه‌و زانیارییه‌ی كه هه‌یه‌تی نایشارێته‌وه ،شتی خه‌ڵكی به كه‌م نازانێت ،له مافی خۆی ئه‌بورێت ،خه‌ڵكی لێی سودین،به‌رده‌وام له هه‌وڵ و كۆششدایه هه‌موو كارێكی به پێی ئاینه‌كه‌یه‌تی ،له ئامۆژگاری په‌ند وه‌رده‌گرێت،به‌هێزو ئازایه له كاری چاكه‌داو دووره په‌رێزه له تاوان،به ماڵ و سامانه‌كه‌ی خێری زۆر ده‌كات.
له زور شتی بێ نرخی دنیا خۆی ده‌گرێته‌وه‌و وه‌ك غه‌ریب وایه زانیاری كه‌مه سه‌باره‌ت به ئاره‌زووه‌كانی ،زانایه به وشتانه‌ی كه ئه‌بنه هۆی نزیكبونه‌وه له خوا.هه‌موو ئاواتێكی خه‌مخواردنێتی له قیامه‌تی،فه‌رمان به چاكه ده‌كات و خۆشی ئه‌نجامی ده‌دات،ڕێگری له خرایه ده‌كات و خۆشی لێی دووره نهێنی و ئاشكراو كردارو گوفتاری موافقی یه‌كن.
١٥٢-ئه‌ی كوڕی شیرینم:توڕیت به ئارامگریت و سوكیت به سه‌نگینیت و ئاره‌زوت به پارێزكاریت و گومانت به دڵنیایت و ناهه‌قیت به هه‌ق و چروكیت به به‌خشنده‌یت تێك بشكێنه.
١٥٣-كوڕی خۆم:خۆت له خه‌ڵك به چاكتر مه‌زانه چونكه خۆ له خه‌ڵك به چاكتر زانین نزیك له نزیك دوور ده‌خاته‌وه و دانایش ناهێڵێت .

١٥٤-ئەی کوڕی نازیزم:لە ڕەوشتی ناشیرین و بێزاری و کەم خۆڕاگری خۆت بپارێزە،ئەگەر لە سەر ئەم ڕەوشتە خراپانە نەبی هاوڕێشت دەس دەکەوێ و خەڵکیش لێت دور ناکەوێتەوە،خۆت بە جۆرێك ڕابهێنە کارەکانت خۆش بوێ،ئارام بگرە لە سەر تاڵییەکانی ژیان،

با لە گەڵ هەموو خەڵکیدا ڕەوشتت جوان بێت،چونکە ئەگەر کەسێك ڕەوشتی جوان بێ و ڕوی خۆش بێ لای چاکان خۆشەویست دەبێ خراپانیش لێی دوور دەکەونەوە

١٥٥-ئەی کوڕی خۆم:لە کاتی توڕەیدا بەسام بەو ،لە کاتی ناخۆشیدا شادمان بەو،لەکاتیخۆشیدا سوپاس گوزار بەو،لە کاتی نوێژدا مل کەچ بەو،لە چاکە کردندا پەلە بکە.

١٥٦-کوڕی خۆم:کاتێ دەسەلاتت هانی دای ستەم لە خەڵکی بکەی،بیری دەسەلاتی خوات بکەوێتەوە بە سەرتدا،ئاگات لە سزای خوا بێت وە سزاکەشی هەمیشەیی یە وکۆتایی نایەت.

١٥٧-کوڕی خۆم:خۆت لە تەماح بپارێزە چونکە تەماح هەژارییەکی ئامادەیە.

١٥٨-کوڕی شیرینم:خۆت لە توڕەیی بپارێزە چونکە توڕەیی دڵی پیاوی دانا لە ناو دەبات.

١٥٩- خۆت لە خۆش گوزەرانی زۆر بپارێزە،چونکە لێپرسینەوەی سبەینێت قورس دەبێت.

١٦٠-کوڕی خۆم:خۆت لە درۆ بپارێزە چونکە ئاینت تێك دەدات و شەخصیەتت لە لای خەڵکی ناهێڵێت

جا ئەو کاتە شەرم و جوانی و سامانت نامێنێ و ڕیسوا دەبی،کاتێ قسە دەکەی کەس گوێت لێ ناگرێ و

باوەڕیشت پێ ناکەن،خێرو خۆشیش لە ژیانێکدا نیە ئەگەر بەم شێوەیە بێت.

١٦١–کوڕم:خۆت لە دەمە قالێ بپارێزە،چونکە ئاشوبەکەی متمانە پێ نەکراوە و داناییەکەشی نابەسترێتەوە.

١٦٢–کوڕی شیرینم:دنیات بە دوارۆژت بکڕە لە هەر دوکیاندا،قازانج دەکەی،دوارۆژت بە دنیا مەکڕە لە هەردوکیاندا زەرەر دەکەی.

١٦٣–کوڕی ئازیزم:فێری چاکە ببەو خەڵکیش فێر بکە،بزانە کە خەڵکی لە خێردان نەگەر ئەوانەی پێشترمان ئەوانەی دوای خۆیان فێرکرد،قسەی زانا وەك کانی خەڵکی پێویستیان پێیەتی ،ڕۆژێك ئەم و ڕۆژێك ئەو

سودی لێ دەبینن،وە خۆ بەکەم زان بە بەڕاستی شایستە ترین کەس بەوە و زانا ترین کەس ئەوەیە کە جوانترین کردەوەی هەبێت.

بزانە هەر کەسێك کە دڵی بە نوری ئیمان ڕوناك بوەوە زمانی هەق دەڵێ و خۆی سودی لێ دەبینێ خەڵکیش سود مەند دەبێت لێی هەر کەسێك خوای گەورە هەق بخاتە سەر زمانی و سودی لێ نەبینێ،ڕوخانی ئاینەکەی لە زمانی دایە،پیاو هەیە بە هۆی یەك وشەیەکەوە خۆی خراپ دەکات هەر وەکو پرشکی بچوك ئاگرێکی گەورە دەکاتەوە .چونکە خوای گەورە هەموو ڕەوشت جوانێکی زمان شیرینی خۆش ئەوێت،ئەوەش سەرچاوەی ڕەوشتی

پیاو چاکانە.

١٦٤–کوڕی خۆم:ئەو کەسەی درۆت بۆ بکات لێی دڵنیامە بە درۆشت بە دەمەوە دەکات .

١٦٥–کوڕی ئازیزم:لە کۆڕو کۆبونەوەدا لە شوێنی بەرزدا دامەنیشە،چونکە شوێنی نزم چاکترە بۆت لە شوێنی بەرز.

١٦٦-کوڕی شیرینم:پەیوەندی نێوان خۆت و خوا بە چاکە ڕامەگرە،چاکەی غەیری خواش بە قەرز بزانە بە سەرتەوە،کەس لە بەر شڕی جلەکانی بە سوك تەماشا مەکە،چونکە خوای ئەو و تۆش یەکە.

١٦٧-کوڕی ئازیزم:کاری بچوك بە کەم مەزانە،چونکە هەر کاری بچوکە سبەینێ گەورە دەبێت.

١٦٨-کوڕی خۆم:داوای پێویستی لە کەسی خوار خۆت مەکە،چونکە ئەگەر شتێکت بداتێ منەت دەکات بە سەرتدا،بەڵکو هەر داوا لە خوا بکە چونکە خوا پێی خۆشە کەسێك داوای لێ بکات،ئەگەر کەسێکیش داوای لێ نەکات لێی تورە دەبێت.

١٦٩-کوڕی ئازیزم:داوای دانایی مەکە لە ناو سکی کاغەزدا و،لە زمانەکانیشەوە مەیبیستە،بەڵکو تەماشای پیشەکە بکەو بیری پیشەوەرەکەشی بخەرەوە هەموو شتێکت پێ دەڵێت.

١٧٠-کوڕی خۆم:داوای کۆتایی کار مەکە و سەرەتاکەشی ڕەفز مەکەرەوە چونکە ئەوە بۆچون کەم دەکاتەوە و
عەقڵ خراپ دەکات.

١٧١-کوڕم:سەرسام مەبە بە چاکەکانت ئەگەر چی زۆریش بێ،چونکە تۆ نازانی ئایا خوای گەورە لێی وەرگرتوی یان نا،زۆر خەڵك سەرقاڵ مەکەو مافیشیان بەتەواوی بدە،ستەمکار مەبەو خۆت لە پاڕانەوەەی
ستەم لێ کراویش بپارێزە،چاو مەبڕە جوانی و ڕازاوەیی دنیا،داوای هەموو جوانی یەکیش مەکە لە دنیا،با هیممەتت لە و شتانەدا بێت کە لە خوای گەورەت نزیك دەخاتەوە.

١٧٢-کوڕی شیرینم:بە لەش ساغی زۆر دڵخۆش مەبە و ناخۆشیت بشارەوە چونکە ئەوە گەنجینەی چاکەیە و ئارامیش بگرە لە سەری بۆت دەبێتە توێشوو لە دوا ڕۆژدا.

١٧٣-کوڕی ئازیزم:لەو زانستەی کە هەتە نەزانی پـێ فێـر بکە،لـە سـەرو زانیـاری خۆشتەوە بە دوای زانستی زانا بکەوە و هاوەڵێتی نەفام مەکە ئەگینا وەکو ئـەوت لێ دێت،دڵخۆش مەبە بە ماڵێك کە ئەمڕۆ تیایدا زیندویت و سبەینێ دەمریت و بـە جێـی دێڵیت.

١٧٤-کوڕی شیرینم:وریای کەسی بەڕێز بە ئەگەر ڕێزت لێ نەگرت ،وریای گێل بـە ئەگەر هاوڕیەتیت کرد.وریای بێ دەسەلات بە ئەگەر دەمـەقاڵێت لـە گـەڵ کـرد،وە تەواوی چاکە لەوەدایە پەلە بکەی لە کردنی.

١٧٥-کوڕی خۆم:لای کەسانی شایستە بە دانایی قسە بکە.

١٧٦-کوڕی خۆم:لە دانایی و هەموو ڕەوشتەکانی تێ بگە و خۆتی پێ سەرقاڵ بکـە و خۆتی بۆ یەکلایی بکەرەوە،کاتێ کۆت کردەوە بیکە بە بیلبیلەی چاوت بزانە کـە دانایی بە دینداری و نەرم و نیانی یەوە نەبێت تەواو نی یە و نـەرم و نیـانیش ئـەزمونی دانایی یە و نمونەی دانـایش بـە بـێ بڕیـاردان وەك ماڵێـك وایـە لـە دەسـتی کەسـی ناشایستەدا کە ڕێ بدات بۆ دزینی بە هەژاری ببینێت،یان وەکو نمونەی مـەڕێك وایـە دەروات بۆ غەیری(زەریبە) یەك کە گورگ دەیبینێ وا دەزانێت بە تەنهایە و دەیخـوات ،لە گەڵ ئەوەشدا بەڵێن بدە بە زمانـت بزانـە کـە زمـان دەرگـای دانـایی یە،ئەگـەر دەرگاکەت پشت گوێ خست هەرچی کە تۆ ناتەوێ هاتو چۆی لێوە ناکات ،ئەگـەر دەرگاکەت پاراست گەنجینەکەت پاراستووە،هەر کەسێك خـاوەنی زمـانی خـۆی بـێ ئەگەر بڕیارێك ببینێت قسە دەکات ئەگەر بڕیاریشی نەبینی قسە ناکات و بـێ دەنـگ دەبێت،

١٧٧-کوڕی ئازیزم:سەرزەنشتی کەسێك مەکـە کـە نیـەتی و داوا دەکـات چـونکە هەرکەسێك خواردنی نەبێت
عەقڵیشی نابێت.

١٧٨-کوڕە ئازیزەکەم: دەمە قالێ لە گەڵ دانا مەکە،دەمە قالێ لە گەڵ ڕۆچودا مەکە،لە گەڵ ستەمکادا مەژی
هاوەڵێتی گومان لێکراویش مەکە.
١٧٩-کوڕەکەی لوقمان بە باوکی وت: کێ دەوڵەمەندترین کەسە؟دەڵێن کەسێك دەوڵەمەندە ماڵ و سامانی زۆر بێ؟لوقمانیش پێی وت:.....نا کوڕم....بەڵکو دەوڵەمەندی لە زانستدایە،
ئەگەر پێویستی بوو دەستی دەکەوێ ئەگەریش لێی بێ نیاز بوو خۆی بەسە.
١٨٠-کوڕی خۆم:ناتوانی کردەوەی چاك بکەی مەگەر بە یەقین وە مرۆڤ کردەوەی نی یە مەگەر بە ئەندازەی یەقینەکەی و هیچ خاوەن کردەوەیەکیش کردەوەی کەم نابێت مەگەر کاتێ یەقینی کەم ببێت .
١٨١-کوڕی خۆم:با گومانی خراپ بە سەرتا زاڵ نەبێت ،چونکە لە نێوان تۆ و خۆشەویستەکەتدا چاکسازی ناهێڵێت.
١٨٢-کوڕی خۆم:لەگەڵ نەفاماندا دامەنیشە و هەرگیز تێکەلاوی دوو ڕوو مەبە .
١٨٣-کوڕی شیرینم:هەر کەسێك دایك و باوکی لە خۆی ڕازی بکات،خوای خۆی ڕازی کردووە،هەر کەسێکیش دایك و باوکی لە خۆی تورە بکات ،خوای لە خۆی تورە کردووە.
١٨٤-کوڕی شیرینم:هەرکەس پشت بە خوا ببەستێ و بەقەزاو قەدەر ڕازی بێ ئەوە ئیمان و باوەڕی جێگیر کردوەو خۆی یەکلای کردۆتەوە بۆ چاکە .
١٨٥-کوڕی ئازیزم:هەرکەس ڕاوێژ نەکات پەشیمان دەبێ، هەر کەس هاوڕیەتی کەسی خراپ بکات سەلامەت نابێ،هەرکەسێ بچێتە شوێنی نەشیاو تۆمەتی بۆ دروست دەکرێ ،هەر کەس ڕقی لە خراپە بێ دەپارێزرێ ،

هەركەس چاكە بكات سوپاس دەكرێ،هەركەس رەحمی نەبێت خواش رەحمی پێ ناكات.

١٨٦-كوڕم:عەقڵی خەڵكی بۆ خۆت بەرە،كوڕەكەی وتی:چۆن؟وتی:لە كارەكانتدا راوێژیان پێ بكە.

١٨٧-كوڕە نازدارەكەم:هەركات خراپەیەكت كرد چاكەیەك بە دوایدا بكە،ئەگەر خەڵكی شانازیان بە جوانی قسەكردنەوە ئەكرد تۆ شانازی بە جوانی بێ دەنگییەوە بكە،كاتێك فەرمانێكیان پێ كردی و پرسیاری شتێكیان لێ كردی بڵێ:بەڵێ،مەڵێ:نەو،چونكە نەو نەزانی و رژدی یە.

١٨٨-كوڕی خۆم كاتێك پێویستت بە دەسەڵاتدارێك بوو زۆری لێ مەكە،و داواشی لێ مەكە مەگەر لە كاتی شێنەیی و دڵخۆشیدا،داوای یارمەتی لە كەسێك مەكە كە فێڵت لێ دەكات و داوای هیچ لە چروكیش مەكە،چونكە ئەگەر نەتداتێ بنەدانەكەی عەیب و شورەییە بۆت،خۆ ئەگەر بشتداتێ منەت دەكات بە سەرتدا،

١٨٩-كوڕی ئازیزم:چاكە بكەو خراپە مەكە بەڕاستی كەسی چاك چاكە ئەنجام دەدات و كەسی خراپیش خراپە ئەنجام دەدات.

١٩٠-كوڕم:ئامۆژگاری وەربگرە ئەگەر چی لە سەریشت قورس بوو هاوار بۆ ئەو كەسەی گوێ نەگرێ گوێ گرتنەكەی سودی بۆی نی یە ،هاوار بۆ كەسێكیش زانست فێر بووەو سودی پێ ناگەیەنێ،هاوار بۆ كەسێكیش گومڕایەو گومڕایی بەسەر رێی ڕاستدا هەڵبژاردووە.

١٩١-كوڕی شیرینم:كاتێ بەڕۆژو بووی بە ئەندازەی پچڕانی ئارەزوت بەڕۆژو بە،بە شێوەیەك كە ئەنجامدانی نوێژەكان تەمەڵت نەكات چونكە نوێژ گەورەترە.

١٩٢-كوڕم:بەڕاستی دانایی هەژاران دەكات بە پاشا.

١٩٣-کوڕی ئازیزو بیلبیلەی چاوم:تاڵی و سوێری زۆرم چەشتوە بەلاَم لە هەژاری تاڵترم نەچەشتوە،

ئەگەر هەژار بوی با خەڵکی باست نەکەن و بەکەمت بزانن،بەڵکو داوای بەخشش لە خوا بکە ،کیَ هەیە

داوای لە خوا کردبیَ و پیَی نەبەخشیبیَ،یان لیَی پاڕابیَتەوەو وەلاَمی نەدابیَتەوە، یان هانای بۆ بردبیَو بە دەمییەوە نەچوبیَ .

١٩٤-کوڕی شیرینم:دایك و باوك دەرگایەکن لە دەرگاکانی بەهەشت ئەگەر لیَت ڕازی بورن دەچیتە بە هەشتەوە، ئەگەر لیَشت تورە بون بیَ بەش دەبیت لە بەهەشت.

١٩٥-کوڕم: ئامۆژگاریت دەکەم بە چەند شتیَك کە لە خوات نزیك دەخاتەوە و لە تورەییەکەی دوورت دەخاتەوە :یەکەم:خوای پەروەردگار بپەرستەو هیچ هاوبەشیَکی بۆ دامەنیَ .

دووەم:ڕازی بە بە قەدەری خوا لە هەرچی پیَت خۆشەو پیَت ناخۆشە.

١٩٦-کوڕی شیرینم:پەنا بگرە بە خوا لە شەڕی خراپەو شەڕی قەزاو قەدەر.

١٩٧-کوڕی شیرینم:بە ڕەزامەندی خوا خەڵکی لە خۆت تورە بکە .

١٩٨-کوڕی ئازیزم:پەنا بگرە بەخوا لە خراپەی ئافرەتان.

١٩٩-کوڕی خۆم:کاتیَ بەڕۆژو بوی بە ئەندازەی پچڕانی ئارەزوت بەڕۆژوبە،بە شیَوەیەك کە لە ئەنجامدانی نویَژەکانت تەمەڵت نەکات چونکە نویَژ گەورەترە لە ڕۆژوو،لە بەر ئەوەی ڕۆژو و بۆ پالَفتە کردنی ڕەوشتەکان و سوککردنی سنور بەزاندنی ئارەزووە و وەرزشیَکی ڕوحیشە،بەلاَم نویَژ بۆ چاکسازیَ دەرونەکانە کە پەناگەی هەموو خراپەکان و سەرچاوەی هەموو ئارەزوویە کە هەرچی پەرستراییَت قیَزەون تر نەبووە لە لای خوای گەورە لە پەرستنی ئارەزو.

# ﴿وتە گشتییەکانی لوقمان﴾

٢٠٠. بەڕاستی دەستی خوا لەسەردەمی دانایانە، هەر کاتێ یەکێکیان قسەدەکات خوای گەورە ووشەکانی بۆ دێنێت.

٢٠١. هەر کەسێك ئامۆژگاری خۆی بکات خوای گەورە دەیپارێزێت، هەر کەسێك خۆی لەخەڵکی بەبچوکتر بزانێت خوای گەورە بەهۆی ئەوەوە سەربەرزی دەکات زەبوونی لەگوێڕایەڵی خوای گەورەدا چاکترە لەسەربەرزی لەسەرپێچی خوای گەورەدا.

٢٠٢. هەر کەسێك درۆ بکات ئاوی دەموچاوی نامێنێتو هەر کەسێکیش ڕەوشتی ناشرین بێت غەمو خەفەتی زۆر دەبێت.

٢٠٣. بێدەنگی دانایيە، بەڵام کەم کەس جێبەجێی دەکات.

٢٠٤. بەڕاستی باوەڕدار ئەگەر سەیری سەرنجامی کارەکانی بکات پەشیمان نابێت.

٢٠٥. ئامۆژگاری لەسەر نەفام قورسە هەروەك قورسی سەرکەوتنی پیری بەتەمەن بەناو شاخوبەردەلاندا.

٢٠٦. بەڕاستی مرۆڤی دووڕو لای خوا بێوەی نابێت.

٢٠٧. هەرکاتێ خوای گەورە بیەوێت خراپە لەناو هەر نەتەوەیەکدا بلاوبێتەوە دەمەقاڵێ لەناویاندا بلاودەبێتەوە وکردەوەیان کەم دەبێت.

٢٠٨. هاوەڵ سێ جۆرە، فێڵباز، پێزان، بەتەماع.

٢٠٩. فێڵباز: ئەوەیە کە چاکەی لەگەڵ دەکەیتو پاداشتت ناداتەوە.

٢١٠. پێزان: ئەوەیە کە چاکەی لەگەڵ دەکەیتو پاداشتت ئەداتەوە.

٢١١. بەتەماعیش: ئەوەیە بەبێ هیچ مەبەستێكی دنیایی حەز ئەكات زوو زوو بتبینێت.

٢١٢. كاتێك قسەت كرد لەكورتی بیبڕەوە، كاتێكیش پێویستییەكەت جێ بەجێكرد قسە مەكە.

٢١٣. فێڵی دڵ بەقسەكردن لەسەر زمان یان بەبینین لەچاودا دەردەكەوێت.

٢١٤. لەگەڵ گێلدا مەژی ئەگەر چی دەوڵەمەندیش بێت... سەیری شمشێر بكە دیمەنی چەند جوانەو ئازارەكەی چەند سەختە.

٢١٥. بەڕاستی قسە هەیە ڕەقترە لەبەردو تیژترە لەدەرزیو تاڵترە لەئارامگرتنو گەرمترە لەپشكۆ، چەندین دڵ هەیە كێڵگەی هەیە ، تۆش لەو كێڵگەییەدا قسەی باش بڕوێنە ئەگەر هەمووشی نەڕوێت هەندێكی دەڕوێت.

٢١٦. نەمبینیوە قورستر بێت لەو وتەخراپەی كەلە دڵدا جێگیر دەبێت هەر وەك جێگیربوونی ئاسن لەئاودا.

٢١٧. پیاوێك تەماشای لوقمانی دەكرد ئەویش پێی وت: ئەگەر بۆ ئەوە سەیرم نەكەی كەدوو لێوی ئەستورم هەیە ئەوا لەنێوانیاندا وتەی نەرمو نیان دەردەچێت، ئەگەر بۆ ئەوەش سەیرم نەكەی كە ڕەش پێستم ئەوادڵم سپییە.

٢١٨. بەلوقمان وترا: چی تۆی گەیاندە ئەو پلەو پایەیە؟ وتی: وازهێنانم لەو شتانەی كە پەیوەندی بەمنەوە نییە.

٢١٩. بەلوقمان وترا: ڕوخسارت چەند ناشرینە؟ وتی: ئایا بەمە ڕەخنە لەمن دەگرن یان لەدروستكارەكەم.

٢٢٠. كوڕەكەی لوقمان بەباوكی ووت: باوكە چی ڕەوشتێك بۆمرۆڤ چاكە؟وتی: ئاینو سامان وتی: ئەی ئەگەر سیان بوو؟ وتی؟ ئاینو سامانو شەرم،وتی: ئەی ئەگەر چواربوو؟وتی: ئاینو سامانو شەرمو ڕەوشتی جوان،وتی: ئەی ئەگەر پێنج بوو؟

وتی:ئاین‌و سامان‌و شه‌رم‌و ڕه‌وشتی جوان‌و به‌خشنده‌یی، وتی: ئه‌ی ئه‌گه‌ر شه‌ش بـوو؟ وتی: كوڕی خۆم، هه‌ر كه‌سێك ئـه‌م پێـنج شـته‌ی له‌خۆیـدا كـۆكردەوه‌ ئـه‌وه‌ پـاك‌و پارێزكارو دۆستی خوایه‌وله‌شه‌یتانیش پارێزراو ده‌بێت.

٢٢١. ئیبن حـه‌ریر ده‌ڵـێ: لوقمـانی حـه‌كیم كۆیله‌یـه‌كی حه‌به‌شـی بـوو پیـشه‌ی دارتاشی بوو، جارێك گه‌وره‌كه‌ی پێی ده‌ڵێت: ئه‌م مه‌ڕه‌مان بۆ سه‌ربب‌ڕه‌ پاشان ئـه‌ویش سه‌ری ده‌بڕێت.

ئینجـا ده‌ڵێـت: چـاكترین گۆشـتم بـۆ ده‌ربێنـه‌ پاشـان ئـه‌ویش زمان‌ودڵه‌كـه‌ی بـۆ ده‌رده‌كات، پاش ماوه‌یه‌كی تر پێی ده‌ڵێ: ئـه‌م مـه‌ڕه‌مان بـۆ سـه‌رببڕه‌ ئینجـا ئـه‌ویش سه‌ری ده‌بڕێت پاشان ده‌ڵێ: خراپترین گۆشتم بۆ ده‌ربێنه‌ لێی پاشان دووباره‌ ئـه‌ویش زمان‌و دڵه‌كه‌ی بۆ ده‌رده‌كات، ئینجا گه‌وره‌كـه‌ی پێـی ده‌ڵێـت: فرمـانم پـێ كـردی چاكترین گۆشتم بۆ ده‌ربێنی لێی زمان‌و دڵه‌كه‌یت بۆ ده‌رهێنام، جاری دووه‌م فـه‌رمانم پێ كردیت خراپترین گۆشتم بۆ ده‌ربێنیت لێـی دووبـاره‌ هـه‌ر زمـان‌و دڵه‌كـه‌یت بـۆ ده‌رهێنـام؟ ئـه‌ویش ده‌ڵـێ: هـیچ شـتێك نییـه‌ پـاكتر بێـت لـه‌و دووانـه‌ به‌مـه‌رجێك خاوه‌نه‌كه‌ی پـاك ڕای بگرێـت هـیچ شـتێكیش نیـه‌ پیـستر بێـت لـه‌و دوانـه‌ ئه‌گـه‌ر خاوه‌نه‌كه‌ی پیسی بكات.

٢٢٢. ده‌گێرنه‌وه‌ دوای ئه‌وه‌ی خوای گه‌وره‌ دانایی به‌لوقمانی حـه‌كیم دا پیاوێـك كه‌ پێشتر ده‌یناسی بینییه‌وه‌ پێی ووت: تۆ تا دوێنێ لای گه‌وره‌كه‌ت شوانی مه‌ڕ بوویت ئه‌ی چی تۆی گه‌یانده‌ ئه‌و پله‌و پایه‌یـه‌؟ وتـی: قـه‌ده‌ری خـواو بـه‌جێهێنانی سـپارده‌و ڕاستگۆیی له‌قسه‌كردنداو بێده‌نگ بونم له‌ شتێك كه‌ په‌یوه‌ندی به‌منه‌وه‌ نه‌بێت.

٢٢٣. له‌خه‌ڵكی خراپ دووربكه‌ونه‌وه‌ بادڵتان ساغ بێت‌و لاشه‌تان ئاسوده‌ بێـت‌و ده‌رونتان ئارامبێت.

٢٢٤. دیدارو گەیشتن بەپیاوچاکان ئاوەدانی دڵانە،دڵ بەوتەی دانایی زیندوو دەبێتەوە هەروەك چۆن زەوی بەبارانی پەلە زیندوو دەبێتەوە.

٢٢٥. جارێك لوقمان دەچێتە خزمەت پێغەمبەر داود(سەلامی خوای لێ بێت) دەبینێت وا داود خەریکی چاککردنی زریّ پۆشەکەیەتی لوقمان نەیزانی داود خەریکی چییە، ویستی پرسیاری لێبکات بەڵام لەدڵی خۆیدا وتی: با پەلە نەکەم ماوەیەك چاوەڕێی کرد تا داود زریّ پۆشەکەی چاك کردوو لەبەری کرد ووتی: بەخوا زرێپۆشێکی چاکەو بەکەڵکی جەنگ دێتو دەمپارێزێت ئینجا لوقمان زانی کە شتەکە چی بوو بۆیە بەداودی ووت: بێدەنگی زێڕەو بەشێکە لەدانایی ویستم پرسیارت لێ بکەم بەڵام خۆم گرت تا خۆت بۆت باسکردمو فێربووم.

٢٢٦. جارێك لوقمان بەدەنکە خەردەلەیەك ئامۆژگاری کوڕەکەی دەکرد، تا خەردەلەکە نامێنێتو لەناو دەچێت، پاشان دەڵێت: کوڕی خۆم ئاکۆژگارییەکم کردیت ئەگەر ئامۆژگارییەکەبۆ شاخێك بوایە ئەوا شاخەکە لەت دەبوو، پاشان دوای ئەمە کوڕەکەی مرد.

٢٢٧. ئەگێڕنەوە کە لوقمانی حەکیم سەردانی عەنتەرەی کرد لە وڵاتێکی تر پێی وت: تۆ عەنتەری؟ تۆ ئازاترین خەڵکی ئەم سەردەمەی؟ ئەتوانی ئازایەتیم فێربکەی عەنتەرە:وتی: پەنجەت بخەرە ناو دەممو منیش پەنجەم دەخەمە ناو دەمتەوە، هەریەکەیان لەیەك کاتدا پەنجەی یەکتریان گەست، لوقمان یەکسەر هاواری لێ هەستا.

عەنتەرەوتی: ئەگەر تۆ هاوارت نەکردایە من هاوارم دەکرد، ئەوە ئازایەتییە کەمێك خۆگربیت تا دوژمنەکەت خۆگری نامێنێت. پاشان عەنتەرە بەلوقمانی ووت: تۆ دانای سەردەمیت ئایا ئەتوانی فێری دانایم بکەیت؟ لوقمان وتی: پەنجەت بخەرە ناو دەممەوە خێرا پەنجەی کردە ناو دەمییەوە! خێرا لوقمان پەنجەی گەست، عەنتەرە کەوتە هاوارکردن لوقمان ووتی: ئەگەر کەمێك بیرت هەبوایە ئەتزانی کەمن دەستت

نەگەستمو ئازارت ئەدەم، ئەو کاتە وا بەئاسانی پەنجەت نەئەخستە ناو دەمـم، بەڕاسـتی ئەمە داناییە ئەبێت پێش ئەوەی بچیتە ناو بیرەوە بزانێت چۆن دێتە دەرەوە.

٢٢٨. چی بچێنی ئەوە ئەدوریتەوە .

٢٢٩. هەروەك چـۆن دوژمـن بـە پەیوەنـدی بەسـتن ئەبێتـە دۆسـت.دۆسـتیش بـە پەیوەندی پچڕان دەبێتە دوژمن.

٢٣٠. ببە بەندەی چاکان و نەبیتە دۆستی خراپ.

٢٣١. هەروەك چۆن لە نێوان گورگ و مەڕدا دۆستایی نیە بـەو شـێوەیە لـە گـەڵ چاکە کار و خراپەکاریشدا دۆستایەتی نی یە .

٢٣٢. دەوڵەمەند بە بێ ترس دەبیت.

٢٣٣. نەرم و نیانی سەر چاوەی هەموو دانایی یەکە .

٢٣٤. داپۆشینی ئەوەی چاودێریم کردوە باشترە لە بلاّوکردنەوەی ئەوەی گومـانم پێ بر دوە.

٢٣٥. پرسیار نیوەی وەلاّمە و گونجان لە گەڵ خەلّکی نیوەی عەقڵە.

٢٣٦. گەورەی ڕەوشتەکانی دانایی ئاینی خوای گەورەیە.

٢٣٧. ڕژدی و ڕەوشت ناشیرینی و زۆر داوای شت لە خەلّکی کـردن نیـشانەی نەفامە.

٢٣٨. کەسی بەڕێز کە زوهدی بوو خۆی بە کەم دەزانێت و کەسی بێ ڕێزیش کە زوهدی بوو خۆی بە گەورە دەزانێ.

٢٣٩. ئارامگرتن دوو جۆرە:ئارامگرتنێك کە پێت ناخۆشـە لات دەدات لـە هـەق ئارامگرتنێك کە پێت خۆشە ئارەزوو بۆ لای خۆی بانگت دەکات .

٢٤٠. لێدانی باوك بۆ منداڵ وەك پەین وایە بۆ کێڵگە.

٢٤١. ڕووخۆشي و دەرخستني خۆ بەكەم زانين و سلاَو كردن و مامەڵەی جوان و وازهێنان لە گوناە دەبنە هۆی خۆشەويستي لە ناو خەڵكيدا .

٢٤٢. ئارامگرتن لە سەر نارەحەتييەكان لە جواني يەقينەوەيە ،هەموو كارێكيش تەواوی و مەبەستي خۆی هەيە،تەواوی پەرستش وەرع و يەقينە،مەبەستي گەورەی و بەرزيش عەقڵي جوانە ،هەركەس عەقڵي جوان بێ ناتەواوييەكاني دادەپۆشي و خراپەكاني چاك دەكات و خوا لە خۆی ڕازی دەكات .

٢٤٣. بە لوقماني حەكيم وترا:كێ ئارامگرترين كەسە؟ ووتي:ئارامگرتنێك ئازاری بە دوادا نەبێ، وترا:ئەی كێ زاناترين كەسە؟وتي:كەسێك زانستي خەڵكي بخاتە سەر زانستي خۆی،وترا:كێ چاكترين كە سە؟وتي: دەوڵەمەند،وترا:دەوڵەمەندی لە ساماندا؟وتي :...نا ئەو دەوڵەمەندەی كاتێ داوای چاكەيەكت لێ كرد لە لای ئەو دەستت بكەوێ ئەگەر نا خۆی بێ نياز بكات لە خەڵكي.

٢٤٤. خۆشبەختي بۆ ئەو كەسەی سودی لە زانستەكەی دەبينێ و گوێ لە قسە دەگرێ و شوێن چاكترينيان دەكەوێ.

٢٤٥. عەقڵ بە ئەدەبەوە وەك درەختي بێ بەر وايە،عەقڵ لە گەڵ ئەدەبدا وەك درەختي بەردار وايە.

٢٤٦. خۆشبەختي بۆ ئەو كەسەی بەدنيا هەڵنەخەڵەتاو لە ڕۆژی دوايشدا پەشيمان نابێتەوە .

٢٤٧. قسە نەزانين نيشانەی كەم عەقڵي يە جا تەماشا بكە بزانە چي دەڵێی .

٢٤٨. هەركەس چاكەكانيانی بژمێرێ بەخشندەيي نامێنێت.

٢٤٩. هەركەس حەزی لە دەمەقاڵێ بێت جوێني پێ دەدرێ.

٢٥٠. جارێك لوقمانی حەکیم:بینرا لە دوای دزێکەوەدەڕۆیشت پێیان ووت :ئەی دۆستی خوا ئەوە لە دوای ئەو بێ باوەڕەوە دەڕۆیت؟!وتی:بەڵێ...بەڵکو داوای لێ بکەم باوەڕ بێنێ و ڕزگار بێ.

٢٥١. دەگێڕنەوە ماڵی لوقمانی حەکیم سادەترین ماڵ بوو ، لە ماڵی جاڵجاڵۆکە سادەتر بوو،لە و بارەوە پرسیاری لێ کرا، لەوەڵامدا وتی :ئەوە زۆرە بۆ کەسێك کە بمرێت.

٢٥٢. ڕۆژگارێك بە سەر خەڵکیدا دێت کە چاوی پیاوی دانا تیایدا ڕوون نابێت.

٢٥٣. هەموو بەیانیان و ئێوارانێك زمان بە ئەندامەکانی تر دەڵێت: ئێوە چۆنن؟دەڵێن:ئێمە باش ئەبین ئەگەر تۆ وازمان لێبێنی .

٢٥٤. پێویستە پیاوی ژیر لە ماڵەوە وەك منداڵ و لە دەرەوەش وەك پیاو خۆی پیشان بدات.

٢٥٥. خوای گەورە ئێسکی ئەوانە دەرزێنێ کە بە ئارەزوی خەڵکی قسە دەکەن.

٢٥٦. هەر خۆشیەك یان ناخۆشییەك کە دێتە ڕێت لە دڵی خۆتدا بەشتێکی چاکی بزانە .

٢٥٧. هیچ شتێك قورس تر شك نابەم لە قسەی خراپ کاتێ کە لە دڵدا دەچەسپێ وەك ئاسن وایە لە ئاودا.

٢٥٨. یەکەم شتێك کە لە دنیادا سودی لێ دەبینی لە دوای هاوەڵی چاك ژنی چاکە .

٢٥٩. هیچ شتێك ماندوکەرتر نی یە بۆ لاشە لە شتی پڕو پوچ (لەهو).

٢٦٠. هەرچی ئەیشاریتەوە لە دوژمنەکەت بۆ دۆستەکەتی ئاشکرا مەکە .

٢٦١. نمونەی کەسی گێل وەك جلی کۆن وایە کاتێ لایەکی دەدورێتەوە لە لایەکی ترەوە دەدڕێت و وەك شوشە وایە یەك ناگرێتەوە .

٢٦٢. دەمە قالێ کلیلی ڕق و کینەیە ڕق و کینەش کلیلی گوناهە .

٢٦٣. چاکە گەنجینەیە،تەماشا بکە بزانە بە کێی دەسپێری.

٢٦٤. بە لوقمانی حەکیم وترا: کێ زاناترین کەسە؟وتی: کەسێك زانست لە خەڵکی وەربگرێت.

٢٦٥. با هەزار دۆستت هەبێت هەرچەندە هەزاریش کەمە،با یەك دوژمنت نەبێت هەرچەندە یەك دوژمنیش زۆرە.

٢٦٦. پشت بە خوا بەستن چاکترین شتە،کەم ئەرك خستنە سەر خەڵکیش ئەوپەڕی وورەیە.

٢٦٧. خۆت لە هاوڕێیەتی درۆزن بپارێزە ئەگەر پەناشی بۆ هێناوی باوەڕی پێ مەکە،باواش نەزانێ کە تۆ بە درۆزنی ئەزانی ڕقت لێ هەڵدەگرێت خووی ئەویش مەگرە.

٢٦٨. زیرەکترین کەس ئەوەیە،ئەنجامی کار بزانێ و خۆی لێ بپارێزێ.

٢٦٩. چاکترین کەس لە پیاوەتی و ڕەوشتدا کەسێکە کاتێ پێویستی هەبوو دوور بکەوێتەوە کاتێکیش پێویستیان پێی بو نزیك بکەوێتەوە .

٢٧٠. هاوڕێی خۆت یان هاوڕێی باوکت خۆش بوێ.

٢٧١. چاکە لە شوێنی شایستەی خۆی بکە،لە شوێنی ناشایستە دایمەنێ چونکە بە هۆی ئەوەوە لە دنیادا

٢٧٢. زەرەر دەکەیت و لە پاداشتی دوارۆژیش بێ بەش دەبی .

٢٧٣. کاتێ یەکێکتان لە بیاباندا بینی پرسیاری ڕێنیشاندانی لێ مەکەن چونکە بە تەنها بونی کەسێك لە بیاباندا گومانی ئەوەی لێ دەکرێت ڕێگرو دز بێت،یان شەیتانێك بێت ڕێتان لێ هەڵە بکات ،وە وریای دوو کەسیش بن مەگەر شتێك ببینن و

من نەیبینم،چونکە کەسی ژیر کاتێ بە چاوی خۆی شتێکی بینی هەق لەوەوە دەناسرێتەوە،ئەوەی کەسی ئامادەش دەیبینێ کەسی نائادە نایبینێ.

٢٧٤. نارەحەتی و ناخۆشی زۆرم بینیوە و هەمیشە لە سەری ئارامم گرتوە .

٢٧٥. خوایە هاوەڵانم بێ ئاگا نەبن،لەوەی ئەگەر یادی تۆم کرد یارمەتیم نەدەن و ئەگەر تۆشم لە یاد کرد یادتم نەخەنەوە و کاتێ فەرمانم کرد بە گوێم نەکەن و کاتێکیش بێ دەنگ بووم خەفەتبارم بکەن.

٢٧٦. ئاگات لەو قسانە بێ کە لە دەمت دەردەچێت،بە بێ دەنگیش بێوەی نابی بەڵکو پێویستە لە سەرت قسەیەك بکەی کە سودت پێ بگەیەنێ .

٢٧٧. بەڕاستی دنیا پردێکە بە سەریدا بپەڕینەوە و ئاوەدانی مەکەنەوە .

٢٧٨. جارێك لوقمانی حەکیم لە گەڵ گەورەکەیدا بوو گەورەکەی چووە سەر ئاو و زۆر مایەوە ،جا لوقمانی حەکیم بانگی کردو وتی:بەڕاستی زۆر مانەوە لە سەر ئاو جگەر توند دەکات و دەبێتە هۆی نەخۆشی مایەسیری و پلەی گەرمی بەرز دەکاتەوە تاسەر جا کەوایە زۆر مەمێنەوەو زوو هەستە،جا کاتێ کە گەورەکەی دەرچوو ئەم پەندەی لە سەر دەرگای سەر ئاوەکە نوسی.

٢٧٩. بەڕاستی زانای دانا بە بێ و سەنگینی خەڵکی بانگ دەکات بۆ لای زانستەکەی ،زانای نا داناش بە سوکی

٢٨٠. و زۆر وتن خەڵکی لە زانستەکەی دوور دەخاتەوە .

٢٨١. بە ڕاستی قسە هەیە لە بەرد ڕەقترە و لە نوکی دەرزی تیژترە و لە گوژاڵك تاڵترەو لە پشکۆ گەرمترە ،دڵەکانیش کێڵگەن جا لەو کێڵگەیەدا قسەی چاك بچێنە خۆ ئەگەر هەموو شی نەڕوێت هەندێکی هەر دەڕوێت.

٢٨٢. با ناخۆشی زۆر بێتە ڕێت بە شێوەیەك کە بۆت نەژمێردرێت.

٢٨٣. به ڕاستی نمونەی ژنی چـاك وەك ڕۆن وایـە بـۆ سـەر کـە ڕەگـەکان نـەرم دەکات و قژ جـوان دەکـات ،وە هـەروەها وەك تـاج وایـە بـۆ سـەری پاشـا و وەك مرواری و گەوهەر وایە کە کەس نرخ و بەهای نازانێت،وە نمونەی ژنی خراپیش وەك لافاو وایە کە بەلاّی کۆتایی نایەت.

٢٨٤. بە شێوەیەك ڕەفتار لـە گـەڵ هاوڕێکـەت بکـە هـەر وەك ئـەوەی کـە هـیچ پێویستیت پێی نیەو ناتوانیت دەست بەر داریشی بیت .

٢٨٥. بە لوقمانی حەکیم وترا:چۆن دانایت بە سـەر پێغەمبەرایەتیـدا هەڵبـژارد لـە کاتێکدا کە پەروەردگارت لە نێوانیاندا سەر پشکی کرد بوی؟ وتـی:ئەگـەر یەکـسەر پێغەمبەرایەتیم بۆ بهاتایە ئومێدم دەکـرد تیایـدا سـەرکەوتوبم بـەلاّم سەرپـشك کـرام، ترسام نەتوانم هەستم بە ئەرکی پێغەمبەرایەتی،جا بۆیە دانایم هەڵبژارد.

٢٨٦. زانـاترین کـەس بـە خـوا کەسـێکە کـە زیـاتر لێـی بترسـێ . خۆتـان لـە خراپـەی خـەڵکی بـەدوور بگـرن دڵتـان سـەلامەت دەبێـت و لاشـەتان دەحەسێتەوە و دەرونتان دەگەشێتەوە.

٢٨٧. لە دوژمن دورە پەرێز بەو ئاگات لە دۆست بێت ڕەخنە لە کەسێك مـەگرە کە یارمەتیت نادات .

٢٨٨. گوێ لە خۆت گەورەتر بگرە.

٢٨٩. سوپاسی ئەو کەسە بکـە کـە چـاکەت لـە گەڵـدا دەکات،چـاکە لـە گـەڵ کەسێکیشدا بکە کە سوپاست دەکات چونکە نیعمەتێك لە ناو ئەچێت کـە سوپاسـی خاوەنەکەی نەکەیت،لە ناویش ناچێت ئەگەر سوپاسی بکەی.

٢٩٠. داود پێغەمبـەر(علیـە الـسلام)بـە لوقمـانی حـەکیمی وت:چـۆن ڕۆژت کردەوە؟لوقمانیش وتی:بە دەستی کەسانی ترەوە ڕۆژم کردەوە .

٢٩١. كاتێك كەوتیتە ناو ئەوشتانەی كـە حـەزت لیٚ یـە و رِقـت لیٚ یە،بـە ئاگابـە لەوەی كە دلـّت شـتێكی تێبـچێت كـە بەرژەوەنـدیت لـەوەدا بێـت كـە تـۆی تـیٚ نەكەوتوی.

٢٩٢. مونافەسە بكە لـە بە دەستهێنانی رِەوشـتدا چـونكە میراتێكـی نەفرِێنـدراوە و هاورِێیەتی شكست نەخواردو و شتێكی تامەزرِۆ كراوە لـە ناو خەلـّكیدا .

٢٩٣. خۆ بەكەم زان بە بەرامبەر بە هەق دەبیتە ژێرترین كەس.

٢٩٤. كەسێك سیٚ شتی تیا بێت ئیمـان و بـاوەرِی تـەواو دەكـات (١)كـە كـاتیٚ خۆشـنود بـوو خۆشـنودییەكەی بـەرەو ناهـەقی نـەبات ،(٢)كـاتیٚ كـە تـورِە بـوو تورِەییەكەی لـە هەق دەری نەكات ،(٣)كاتیٚ كە رِێزی لیٚ گیرا ئەوەی لیٚ دەگیریٚ كە لـەویٚ نیە.

٢٩٥. جوانی نیەت لـە پەرستـشدایە و جـوانی دانیـشتن لــە لـوتكـەی زانـستدایەو رِەوشتی ناشیرین لـە چروكی دایەو رِەوشتی جوانیش لـە بەخشندەیی دایە.

٢٩٦. دانایی ئەوەیە ببوری لەو كەسەی كە ستەمت لیٚ دەكات و پاداشتی خراپەش بە چاكە بدەیتەوە.

٢٩٧. فێلّی دلـّەكان لـە وشەی سەر زمان یان لـە رِوانینی ناو چاودا دەردەكەویٚ.

٢٩٨. هیچ خێرت تیا نییە ئەگەر فێر نـەبیت لــە كاتێكـدا كـە نـازانی و كـاریش نەكەی بەوەی كە فێر دەبیت ،نمونەی ئەوەش وەك كەسێك وایە كـە كۆمـەلـّێك دارو چیلكە كـۆ بكاتــەوە و گـورزەی بكـات پاشـان بیـەویٚ هـەلـّیبگریٚ و نـەیتوانیٚ،تا كەسێكی تر بێت بۆی هەلـّبگرێت.

٢٩٩. وەك ئەو كەسە وابە كە نایەویٚ خەلـّكی سوپاسی بكەن و كارێكیش ناكـات خەلـّكی غەیبەتی بكەن، خۆی لـەناو خەلـّكیدا قورس نیشان دەدات و خـەلـّكیش لـیـی بێوەین .

٣٠٠. مام ناوەند بەو زیادەڕۆیی مەکە،ماڵت مەگرەوە لە بەخشین و زیادەڕۆیشی تیا مەکە.

٣٠١. خەوتوان چۆن بەلایانەوە دوورە ئەوەی کە بەڵێنیان پێدراوە بۆ لای ئەوەی کە بەڵێنیان پێدراوە بە پەلە ڕادەکەن .

٣٠٢. کاتێ تەمەنی لوقمان گەورە بوو داود(علیه‌السلام)پێی گەیشت و لێی پرسی چی لە عەقڵت ماوە؟ لوقمان وتی:قسە لە شتێکدا ناکەم کە پەیوەندی بەمنەوە نەبێ و زۆر لە خۆم ناکەم لە کارێکدا کە پێویستم پێی نەبێت.

٣٠٣. لە تەنیایدا لە ئافرەت ئەمین مەبە،ئاوڕ لە هەژارێکیش مەدەرەوە کە خۆی بە بێ نیاز بزانێت لێت .

٣٠٤. واز لە هاوڕێی یەکەمت مەهێنە هاوڕێی دووەمت متمانەی پێت نامێنێ .

٣٠٥. نەکەی واز لە تەماشاکردنی خراپەکانت بێنی، لە بەر ئەوەی وازهێنان لەوە دەبێتە هۆی ناتەواوی بۆ چاکەکانت.

٣٠٦. لوقمان زۆر بە تەنها دادەنیشت جارێك گەورەکەی پێی دەڵێت بە ڕاستی تۆ زۆر بە تەنها دادەنیشی ئەگەر تێکەڵی خەڵك ببی باشترە،لوقمانیش لە وەڵامیدا دەڵێ :بەڕاستی زۆر بە تەنها بون دەبێتە هۆی زۆر بیر کردنەوەی زۆریش ڕینیشاندەرە بۆ ڕێی بە هەشت .

٣٠٧. نزمترین ڕەوشت بریتی یە لە فێڵ کردن لە هاوڕێ و نهێنی نەپاراستن و باوەڕکردن بە هەموو کەسێك و قسە زۆر کردن لە شتێکدا کە پەیوەندی پێتەوە نەبی و داوا کردنی زۆر لە کەسی چروك.

٣٠٨. نەکەی دەمەقاڵێ بکەی ،چونکە دەبێتە هۆی خوێن ڕژان خوێن ڕژانیش دەبێتە هۆی تیا چوون.

٣٠٩. نەکەی دەمەقالێ لە گەڵ زانایاندا بکەی چونکە دانایی لە ئاسمانی ڕونەوە دابەزیوە کەسانێك هەن نایزانن و دەیبەن بۆ خۆیان.

٣١٠. پرسیار کرا لە لوقمانی حەکیم:چی کردەوەیەکی خۆت بەلاوە گرنگە.وتی:وازهێنانم لەو شتانەی کە پەیوەندییان بە منەوە نیە.

٣١١. تورەیی مرۆڤی ژیر لە کرداریدایەو تورەیی نەفامیش هەر لە کرداریدایە .

٣١٢. چاو پاراستنم و زمان گرتنم و ئەمەکداریم بەرامبەر پەیمانم و حەلاڵ خواردنم و پاراستنی داوێنم و هەستانم بە ئەرکی خۆم و ڕێزگرتنم لە میوانم و چاکبونم لە گەڵ دراوسێم و وازهێنانم لەو شتانەی کە پەیوەندییان بە منەوە نی یە ئا ئەمانە منیان گەیاندە ئەم پلە و پایەیە.

٣١٣. مەبەست بون لە ڕۆیشتندا نیوەی تفاق و کەل و پەلە .

٣١٤. هەروەك چۆن پاشاکان وازیان لە دانایی هێنانەوە بۆتان ئێوەش واز لە دنیا بێنن بۆیان.

٣١٥. دەگێڕنەوە لوقمانی حەکیم لە ناو عەریشەکەیدا بوو کە بە ئەندازەی شوێنی ڕاکشانی بوو،کوڕەکەشی لە بەردەمیدا دانیشتبوو لە سەرەمەرگدا بوو،لوقمان گریا،کوڕەکەی وتی: باوکە بۆچی دەگری؟ئایا لە مردن دەترسی؟یان حەزت لە مانەوەیە لە دنیادا؟لوقمان وتی:نا لە بەر هیچیان نی یە ،بەلام لە بەر ئەو سەفەرە دورو درێژ و ڕێگە سەختەی پێشم و تێشووی کەمی خۆم و باری قورسم دەگریم،نازانم ئایا ئەو بارە قورسەم لە کۆڵ دەکەوێ تا دەگەمە ئەنجام ،پاشان بە شانمەوە دەمێنێتەوە ئینجا لە گەڵ خۆی دەمبات بۆ دۆزەخ دوای ئەوە مرد (خوای گەورە لێی خۆش بێت).

٣١٦. دەگێڕنەوە لوقمان بەندەیەکی حەبەشی بو،خاوەنەکەی هێنایە بازار بۆ ئەوەی بیفرۆشێت،هەر کڕیارێك بهاتایە لوقمان پێی دەوت:چ کارێکم پێ دەکەی ؟ئەگەر

بیوتایە ئەوەو ئەوەت پیّ دەكەم ،پێی دەوت تكات لیّ دەكەم نەمكڕیت،تا پیاوێك هاتە لای لوقمان پێی وت:چی كارێكم پێدەكەی ؟وتی: دەتكەم بە دەرگاوان،پێی وت:بمكڕە جا كڕیتی و بردیەوە بۆ ماڵ،گەورەكەی سێ كچی هەبوو لە گوندەكەدا باخی دەبون،گەورەكەی ویستی لە ماڵ دەربچێت ،پێی وت:كچەكانم كردۆتە ژورەوە و خواردن و خواردنەوە و هەموو پێویستیەكم بۆ دابین كردون،كاتیّ لە ماڵ دەرچوم دەرگایان لە سەر دادەخەم تۆش لە پشت دەرگاكەوە دابنیشە و بۆیان مەكەرەوە تا دێمەوە ،كاتیّ لە ماڵ دەرچوو فەرمانەكەی بە جیّ هێنا،كچەكان پێیان وت:دەرگاكە بكەرەوە.بەقسەی نەكردن بۆیە لێیاندا و دەموچاویان برینداركردجا خوێنەكەی شۆری و دانیشت كاتیّ گەورەكەی گەڕایەوە بۆ ماڵ بە سەرهاتەكەی بۆ باس نەكرد دوبارە گەورەكەی ویستی لە ماڵ بچێتە دەر ،پێی وت:هەموو پێداویستیەكم بۆ دابین كردون و دەرگایان لیّ مەكەرەوە،بۆیە دوبارە لێیانداو برینداریان كرد، ئەویش خوێنەكەی شۆری و دانیشتەوە كاتیّ گەورەكەی گەڕایەوە ،كچە گەورەكەیان وتی :ئەم بەندە حەبەشی یە بە قسەی خوا دەكات بەلاّم بە قسەی من ناكات سوێند بە خوا دەبێت تەوبە بكەم جا تەوبەی كرد كچە بچوكەكەیان وتی:ئەم بەندە حەبەشی یە،گوێڕایەڵی خوا دەكات وە خوشكە گەورەكەشم گوێڕایەڵی خوا دەكات،سوێند بە خوا دەبێت تەوبە بكەم،جا تەوبەی كرد،خوشكە ناوەنجی یەكەیان وتی:ئەو بەندە حەبەشی یە و ئەو دوو خوشكەم گوێڕایەڵی خوا بكەن سوێند بە خوا دەبێت تەو بە بكەم جا تەوبەی كرد،گومڕای گوندەكەش وتی:ئەو بەندە حەبەشی یە و ئەو سێ خوشكە گوێڕایەڵی خوا دەكەن سوێند بە خوا دەبێت منیش تەوبە بكەم جا هەموویان تەوبەیان كردو گەڕانەوە بۆ لای خوا و بون بە خواپەرستی گوندەكە .

٣١٧. لوقمانی حەكیم چوو بۆ سەفەرێك لە ڕیّ گەیشت بە گەنجێك پێی وت:باوكم چی دەكات؟گەنجەكە وتی مردووە ،لوقمان وتی:سوپاس بۆ خوا كارم بە

دەستە ،لوقمان وتی:دایکم چی دەکات؟ غولامەکە وتی:مردوە،لوقمان وتی:غەمم نەما،لوقمان وتی:ژنەکەم چی دەکات؟گەنجەکە وتی:مردوە،لوقمان وتی جێگەکەم تازە بووەوە،لوقمان وتی:خوشکەکەم چی دەکات؟ گەنجەکە وتی :مردوە،لوقمان وتی:عەیب و عارم داپۆشرا،پاشان لوقمان وتی:براکەم چی دەکات؟ گەنجەکە وتی:مردوە،لوقمان وتی:پشتم شکا،پاشان لوقمان وتی:کوڕەکەم چی دەکات؟گەنجەکە وتی:مردوە،لوقمان وتی:دڵم لەت بوو!.

٣١٨. دەگێڕنەوە لە سەردەمی لوقمانی حەکیم گەنجێك چاوێکی ئازاری هەبوو ،هەرچی پزیشکی ئەو کاتە هەبوو بردیانە لای سودی نەبو دواتر باوکی بردی بۆ لای لوقمانی حەکیم،دوای ئەوەی کە لوقمان سەیری چاوەکەی کرد پێی وت:خۆزگە دەستت بېرایەتەوە،باوکی گەنجەکە لەم قسەیە تێ گەیشت و ئەوانەشی لەو مەجلیسە دابون تێگەیشتن کە ئەو گەنجە زۆر دەست دەدات لە چاوی،هەرکاتێ چاوی چاك بوایەتەوە دووبارە هەمان نە خۆشی توش ئەبۆوە،بە هۆی ئەوەی دەستی پیسی لە چاوی ئەدا تا گەنجەکە بە یەکجاری وازی لەو عادەتە هێنا و چاوی چاك بۆوە .

٣١٩. رێز لە دانایی خوا بگرە لە لای کەسێك دایمەنێ کە بە کەمی بزانێ،چروکیش مەبە تیایدا لای کەسێك کە بیەوێت لە بەری بکات.

﴿سُبۡحَـٰنَ رَبِّكَ رَبِّ ٱلۡعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ ، وَسَلَـٰمٌ عَلَى ٱلۡمُرۡسَلِينَ ، وَٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَـٰلَمِينَ﴾

# سەرچاوەکان

١. سۆمای دیدە – عادل شاسواری.
٢. گوڵبژێرێك لە وتەی دانایان و زانایان – سەردار رەزا.
٣. وصایا لقمان لابنه و حکمه – خالد محمد خادم السروجي.
٤. إهتمام اولي همم العالية الى إغتنام أيام الخالية – عبدالعزيز المسند.
٥. لقمان الحكيم و حكمه – محمد خير رمضان يوسف.
٦. لقمان الحكيم – محمد عبدالرحيم.
٧. أقوال و حكم – مؤمن محمد رضا.